# شێواز

## لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا

حەمە نوری عومەر کاکی



# شێواز لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا

نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم
(( لەناوچەی سلێمانی ))

حمە نوری عمر کاکی

مەڵبەندی کوردۆلۆجی

هەرێمی کوردستان
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
مەڵبەندی کوردۆلۆجی


- ناوی کتێب: شێواز لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا
- بابەت: لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی
- نووسەر: حەمە نوری عمر کاکی
- پیتچنین: ئاراس حسن احمد
- دیزاین و سەرپەرشتیی چاپ: بڕیار فەرەج کاکی
- بەرگ: رەنج شوکری
- ژمارەی سپاردن: ٢٢٠٧ / ساڵی ٢٠٠٨
- چاپخانە: تیشك/ چاپی یەکەم، سلێمانی
- تیراژ:١٠٠٠ دانە
- نرخ:٣٠٠٠ دینار
- زنجیرە: ٢١



مەڵبەندی کوردۆلۆجی
ناونیشان: سلێمانی، گردی ئەندازیاران- گەڕەك/ ١٠٥، کۆڵان/ ٢٥، ژ.خانوو/ ٤، ژ. پۆست/ ٩٥
تەلەفون: ٣١٩٣٠٩٣ — ٣١٩٣١٧٥
kurdology2006@yahoo.com

## ناوەڕۆك


| | |
|---|---|
| **پێشەکی** | 7 |
| **بەشی یەکەم / شێواز** | **9-11** |
| شێواز و زمان | 12 |
| شێواز چییە؟ | 13 |
| چەمکی شێواز | 14 |
| چەمکی نوێی شێواز | 15 |
| پێناسەی شێواز | 18 |
| شێوازو بابەت | 26 |
| شێوازی ئەدەبی | 29 |
| **بەشی دووەم/ شێوازی شیعری کلاسیکیی کوردی** | **33-35** |
| میرنشینی ناوچەی سلێمانی | 35 |
| دروستکردنی شاری سلێمانی | 39 |
| قوتابخانەی شیعریی ناوچەی سلێمانی | 41 |
| زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو | 50 |
| کاریگەری زمانو ئەدەبیاتی نەتەوە موسوڵمانە دراوسێکان | 64 |
| کاریگەری زمانو ئەدەبی عەرەبی | 65 |
| کاریگەری زمانو ئەدەبیاتی فارسی | 68 |
| کاریگەری زمانو ئەدەبیاتی تورکی | 71 |
| کێشو قافیە لەم قوتابخانە شیعرییەدا | 73 |
| **بەشی سێیەم/ شێواز لە بەرهەمی شیعری نالی و سالمو کوردی** | **85-87** |
| شێوازی شیعری نالی | 89 |
| بیروردی، لێکچواندن، رەگەزدۆزی | 94-105 |
| شیوازی شیعری سالم | 105 |
| بیروردی، ئالۆزی، شێوەی هندی | 106-119 |
| شێوازی شیعری کوردی | 120 |
| روونی، کورتبڕی | 121-126 |
| وشەو زاراوەو لێکسیکۆن | 127 |
| **سەرچاوەکان** | **135** |
| **پوختەی بابەت بە زمانی ئینگلیزی** | **140** |

# پێشەکی

مێژووی ئەدەبی هیچ نەتەوەیەك لەسەر یەك ڕێباز و شێوەو قوتابخانەیەکی ئەدەبی دیاریکراو نەڕۆیشتووە، بەڵکو لەسەرەتای پەیدا بوونی ژیانی ئەدەبەوە هەر سەردەم و قۆناغ و ماوەیەك گۆڕانێکی ئەدەبی یان سەرهەڵدان و دروست بوونی ڕێبازێکی هونەری نوێ لە مێژووی ئەدەبدا روویداوە، دیارترین و گرنگترین قۆناغی مێژووی ئەدەبی کوردیش لەماوەی سەدەی نۆزدەیەمدا بوو ، ئەویش بەسەرهەڵدانی بزوتنەوەیەکی ئەدەبی نوێ لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا لەسەر دەستی سێ کەڵە شاعیری کورد لەناوچەی سلێمانی ، هەر بەهۆی ئەو گۆڕانە بنەڕەتی و سەرەکیەوەیە کە ئەم سەردەمە لەمێژووی ئەدەبدا لە هەموو سەردەمەکانی تر زیاتر بۆچوون‌و لێکۆڵینەوەی بەخۆوە بینیوە ، بەڵام بە گشتی زۆربەی زۆری ئەو لێکۆڵینەوانەش لەچوارچێوەی کلاسیزم‌و دیاری کردن و ناساندنی قوتابخانەی کلاسیکی و ئەو دەستورانەی لە شیعری کلاسیکیدا پێرەوی کراوە نەچوونەتە دەرەوە ، زۆربەی لێکۆڵینەوەکانیش لەبارەی ژیان و دیاری کردنی هەندێ لایەنی هونەری سەبارەت بە شاعیرێك یان چەند شاعیرێکی سەر بەم قوتابخانەیە بوون. بە کورتی ئەو لێکۆڵینەوەو نووسینانە بەهیچ جۆرێك مەودای باسەکانیان بەرەو بابەتێکی زانستی وەك شێواز نەبردووە و نەیانتوانیوە شێوازی تایبەتی ئەم قوتابخانەیە بە گشتی و شێوازی شیعری هەریەکە لەو سێ شاعیرە بەتایبەتی دیاری بکەن.

ئەمە لەلایەك ، لەلایەکی تریشەوە گەلێ لایەنی زانستی بە گشتی لە ئەدەبی کوردیدا پشتگوێ خراوە ، یەکێ لەو بابەتە زانستیانە شێوازە کە دەتوانین بڵێین وەك لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیەکی ئەدەبی تا ئێستا کەس ئاوڕی لەم لایەنە نەداوەتەوە.

ئەمانەو گیانی خزمەت کردن و هەوڵدانێکی دڵسۆزانە بۆ بەرهەمێکی نوێ و پێشکەشکردنی بە ئەدەبەکەمان هانی داین بۆ هەڵبژاردنی ئەم بابەتە کە بریتییە لە ((شێواز لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا ، نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم )) تا بەو هۆیەوە سەرەتایەك بۆ ئەم بابەتە بکەینەوە و بۆچوون و تیڕوانینێکی ڕاست سەبارەت

بە شێوازی ئەو قوتابخانە شیعریەی لەسەردەستی نالی‌و سالم‌و کوریدا دروست بوو پیشان بدەین.

بەم جۆرە لێکۆڵینەوەکەمان بابەتی ((شێواز))ی بەگشتی گرتۆتە خۆو بەتایبەتیش شێوازی ئەو بزوتنەوە ئەدەبیە و رابەرانی.

بەپێی ئەم مەبەستانە لێکۆڵینەوەکەمان لە سێ بەش پێکهاتووە:

بەشی یەکەم بەناوی (شێواز) بەپێی رێبازی زانستی بەگشتی سەبارەت بە شێواز دوواوین و لە پێوەندی زمانەوە دەسمان بە کارەکەمان کردووە و پێوەندی نێوان زمان و شێوازی دەربڕین، واتە شێوازو زمان، چەمکی کۆن‌و نوێی شێوازمان دیاری کردووە، هەروەها لەم بەشەدا جیابوونەوەی بابەتی زانسی و ئەدەبی لەڕووی شێوازەوە باس کراوەو لەشێوازی ئەدەبی دوواوین.

لەبەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەدا لە ژێر ناونیشانی ((شێوازی قوتابخانەی شیعری کلاسیکیی نوێی ناوچەی سلێمانی )) . هەوڵمان داوە لەڕووی مێژووییەوە سەبارەت بەو سەردەمە و باری ژیانی شاعیران و لایەنی دەسەلاتی رامیاری و ئاینی و کاریگەرییان لەسەر شێوەی خوێندن لە ناوچەکەدا بدوێین، بۆیە بە کورتە باسێکی میرنشینی ناوچەی سلێمانی سەر دەقی بابەتەکەمان شکاندووە ئینجا لە چۆنییەتی دروست بوونی ئەو قوتابخانە ئەدەبیە دوواوین و سەردەم و شوێنیمان لە مێژووی ئەدەبدا دیاری کردووە. تایبەتی و خاسیەتەکانی شێوازی ئەم قوتابخانە شیعرییەمان بەگشتی لەڕووی کاریگەری زمان و ئەدەبیاتی نەتەوە هاوسێکانەوە پیشان داوە. کێش و قافیەش دوا باسی ئەم بەشەی پێکهێناوە.

بەشی سێیەم تایبەتە بە شێوازی بەرهەمی شیعری ئەو سێ کەڵە شاعیرە، بەهۆی ئەوەوە کەشێوازی هەر یەکە جیاوازە لەم بەشە خۆی لەخۆیدا بووە بە سێ بەشی بچوکەوەو لەهەر بەشێکدا شێوازە تایبەتیەکان و خاسیەتی شیعری یەکێ لەو سێ شاعیرەمان خستۆتە روو.

بێگومان ئەو هەوڵ‌و کۆششەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا دراوە هەنگاوێکە بۆ بەرەوامی هەنگاوەکانی تر هەردەم چاوەڕێی هەوڵ‌و کۆششی دڵسۆزانەی هەموو مامۆستاو ئەدەب دۆستێکین کە بەگیانی پاک‌و زانستیانەوە بڕوانێتە ئەم هەوڵەو هێزو تینی زیاتری پێ ببەخشێ بە ئامانجی خزمەت کردنێکی دڵسۆزانەی زمان و ئەدەبەکەمان.

# شێواز

**سەرەتا :**

پێش ئەوەی راستەوخۆ بچینە ناو باسە سەرەکیەکەمان، بەپێویستی دەزانین سەرەتای باسەکە لەخاڵێکی گرنگو کەرەستەی خاوی زۆربەی زانستیە مرۆڤایەتیەکانەوە دەست پێ بکەین کە ئەویش زمانە.

مرۆڤ هەر لەسەرەتای ژیانییەوە پاش ئەوەی بەهۆی بزاوتنو جولانەوەی ئەندامەکانی لەشیەوە، بۆ دەربڕینو گوزارشت کردن لە پێویستیەکانی ژیانی زمانی بەکارهێناوە.

زمان کلیلی گەلێ ئاڵۆزیی ژیان بووەو دەستکەوتێکی گرنگی مرۆڤایەتیە، هەر بۆیە بە گەلێ شێوازو شێوەی جۆراوجۆر پێناسە کراوە (بێگومان پێناسەی زانایانی دەروونو زانایانی زمانەوانی و زمانەوان و ئەندازیاری دەنگو فەیلەسوفەکان ناشێ وەك یەك بن لەبەر ئەوە زمان دەیان پێناسەی جیاوازی بۆ کراوە)[1] سەرەنجامی ئەو لێکۆڵینەوە و توێژینەوە زانستیانەی لە زانستی زماندا کراون ئەو راستیە دیاری دەکەن کە زمان ئەرکێکی گرنگی گرتۆتە ئەستۆ ئەویش بریتیە لە گواستنەوەی بیرێك کە لەوەو بەر لە مێشکی کەسێکدا هەیە بۆ کەسانێکی دیکە (گوێگر یان خوێنەر). بەمە دەوترێ ئەرکی زمان، ئەم ئەرکەی زمانیش دەبێت بەدوو بەشەوە، هەردوو بەشەکەش بەناویەکدیدا چوونو تێکەڵن ، ئەم دوو بەشەش ئەمانەن :

١. گوزارشت کردن و دەربڕینی پێویستی و بەرژەوەندیەکانی ژیانی رۆژانەی مرۆڤ.

٢. گوزارشت کردن و دەربڕینی هەستو سۆزی مرۆڤ.

بێگومان زمان لەسەرەتاوە، واتە یەکەم جار، ئەرکی یەکەمیانی گرتۆتە ئەستۆ، چونکە پێویستییە سەرەکیەکانی ژیان پێش سۆزو هەست دەکەون. چۆنییەتی دەربڕینو گوزارشت کردن لەو دوو جۆرە ئەرکەش بەگەلێ شێوەو شێوازی جۆراوجۆر دەردەبڕرێت.

---

[1] محمد معروف فتاح، زمانەوانی، هەولێر، ١٩٨٧، ل٤ ، کتێبێکی مەنهەجیە.

مەیدانی لێکۆڵینەوەکەی ئێمە دەکەوێتە بەشی دووەمی ئەرکەکانی زمانەوە واتە شێوازی دەربڕینی هەست و بیرە گوزارییەکانی مرۆڤ دەگرێتەوە. لەم بەشەشدا بەتەنیا بەرهەمی ئەدەبمان مەبەستە. زۆربەی رەخنەگران لەوەدا یەکدەگرنەوە کە رەگەزەکانی ئەدەب بە چوار رەگەز دیاری دەکەن کە ئەمانەن : سۆز، واتا، شێواز، ئەندێشە[2]

لێکۆڵینەوەکەمان رەگەزی شێواز دەگرێتەوە لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم، لە ناوچەی سلێمانی.

## شێواز و زمان

کەرەسەی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە شێوازگەرییەکان بریتیە لە وشە و زاراو و رستە. لە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی بەرهەمێکی شیعری شاعیرێك یا بەرهەمی سەردەمێکی دیاریکراودا دەبێ زمان و مامەڵە کردن لەگەڵ وشە و زاراوەکاندا و چۆنییەتی دارشتنیان بکرێت بەبنەما و تەوەری لێکۆڵینەوە. بۆیە پێویستە لەلایەنە رێزمانییەکانو واتاو ئامانجی ئەو لایەنە رێزمانییانە بکۆڵینەوە[3] . چونکە لایەنە رێزمانییەکانی رستەکان لە پێکهاتنی زمانەوانی دەکۆڵێتەوەو ئەنجامەکەشی هەوڵی تێگەیشتنی پەیوەندییە لۆژیکیەکانو دەستورە زمانییەکان دەدات کە ئەو رستانەیان لەسەر بنیاد نراون، دیسان زۆربەی کات واتاکان لەژێر کاریگەری سروشتی رێکخستنی بیرە ناوەرۆکیەکاندا کە بەشێوەیەك زیاتر ، یان باشتر بڵێین، بەچەند شێوازێکی جیاجیا دەردەبڕرێن و گوزارشتیان لێ دەکرێت. بیر بەتەنیا ناتوانێ گوزارشت لە واتا ومەبەستەکان بکات کە لەلای هەڵگری ئەو بیرە هەیە، دەبێت ئاوێتە و تێکەڵاوی زمانێك بێت و لەشێوازێکی لەبار و گونجاودا دەربڕێت، یەکێك لە بنەماکانی رەخنەسازی ئەوەیە لە رەوانبێژیدا جیاوازی لەنێوان بابەتو رێباز، رێچکە،رێگادا بکرێ، یان ئەو وتە و قسەیەی دەبێژرێ لەگەڵ چۆنییەتی ئاراستە کردن و گۆ کردنی

---

[2] أحمد امين، النقد الادبي، مجلد ١-٢، بيروت، ١٩٦٧، ص٣٨.

[3] وشەی رێزمان لە زانستی زماندا واتایەکی جیاوازی هەیە، جگە لەو واتایەی بەمانای رێزمان (grammer)دێت، بەڵام لێردا بەمەبەستی ئەو یاسایانەیە کە وەسفی زمان دەکات وەك چۆنە بەو شێوەیە وەسفی رستە دەکات و سەر بەزانستی زمانی وەسفیە Discriptive linuistice

ئەو وتەو بێژەیە. ئەم کارەش بەزۆری بەشێوەی خوازە (مجاز) دەکرێ، باوترین جۆری خوازەش ئەو وتەیەیە کە دەڵێ : (زمان بەرگی بیرە)[4] . شێوەی ئەم بیرە بێنینە پێش چاوی خۆمان، کە پێش ئەوەی لە زار بێتە دەرەوە پاشان بە چ تەرزێ جلو بەرگی زمانی بۆ دەدورێتو بەبەریدا دەکرێ. گراهم هوف ئەم مەبەستەی بەهێنانەوەی پارچەیەك لە پێشەکی چامەکەی (درایدن) روون کردۆتەوە کە بەناوی (ساڵی سەیرو سەمەرە) یان (ساڵی سەرسوڕهێنەر = العام العجیب)ەوەیە. کە تیادا دەڵێ (یەکەم بەختیاری شاعیر ئەوەیە کە بیرێك لە خەیاڵی خۆیدا دەدۆزێتەوە، بەختیاری دووەم لەوێنە کێشان و دیاری کردنی ئەو بیرەدایە (وەرگرتن و داڕشتنی ئەو بیرە) سێیەمیشیان لە ئاشکراکردنو دەربڕیندایە، یان لە هونەری پۆشاك و ئارایشت کردنی ئەو بیرەدایە کە ئەم واتە شاعیر بە وشەی گونجاوی بێدەنگ و واتادار دەیڕازێنێتەوە[5] بەپێی ئەم تیۆرە بیە بە ئاسانی دەتوانین شێواز دیاری بکەین و بزانین شێواز کامەیانە ؟ زمان جلو بەرگی بیرە... ، شێوازیش چۆنییەتی تانو پۆو چنینو درروونی تایبەتی ئەو جلو بەرگەیە.

**شێواز چییە ؟**

وشەی شێواز - Style - زاراوەیەکی کۆنە لەسەرەتای سەرهەڵدانی بیرە ئەدەبیەکانەوە سەری هەڵداوە، لە وشەی (Stylus) ی گریکە لاتینییەوە هاتووە. ستیلۆس لەزمانی یۆنانیدا بەئالەتێك دەوترا یان تیغێکی مەعدەنی یان دارێك یان پارچە عاجێ کە لەکۆندا وەك شێوەی قەڵەم دروست دەکرا و لەسەر پارچە مۆمێکی پانکراوە نووسین و وێنەیان پێدەکێشا[6] . لەزمانو ئەدەبی عەرەبیدا (ئوسلوب) بەواتاو مەبەستی رێگا، رێڕەو، رێچکە، رێباز، . . . هتد (الطریقة، المنوال، الجهة، المذهب، القالب)[7] بەکار هاتووە.

---

[4] گراهم هاف، السلوب و الاسلوبیة، ترجمة کاظم سعدالدین، بغداد، ١٩٨٥، ص٢٠.

[5] سەرچاوەی پێشوو، ص٢٠.

[6] محمد تقی بهار (ملك الشعراء)، سبك شناسی، تأریخ تطور نثر فارسی، جلد آول،چاب دووم١٣٣٧، ص.د

[7] لسان العرب، (سلب).

له زمانی کوردیدا بەواتای ڕێگا، ڕێباز، ڕێڕەو و شێوەو خووڕەوشتو هەڵسوکەوت، هەرچەندە وکو بابەتێکی ئەدەب بەکارنەهاتووە لە لێکۆڵینەوەو نووسیندا، بەڵام بەگشتی بەو واتایانەی سەرەوە ڕۆیشتووە.

لە زمانو ئەدەبی فارسیدا بە (سبك) ناوبراوە، سەبك لە زاراوەی ئەدەبیدا بریتیە لە ڕێبازێکی تایبەتی بۆ تێگەیشتنو تێگەیاندن بەهۆی ڕستەی لەبارو گونجاو هەڵبژاردنی وشەو شێوەی توێژینەوەیەکی تایبەتی بۆ تێگەیاندنی خوێنەر8 . بەگشتی شێواز لە بابەتە ئەدەبیەکاندا بۆ دەربڕینو گوزارشت کردنو چۆنییەتی گەیاندنی بیرو مەبەستی یا چۆنییەتی دووان و قسەکردن یا نووسین بەکار هاتووە ، جگە لەمە لە بابەتی زانستیشدا زاناکان (شێواز) بەکار دێنن بۆ ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی.

## چەمکی شێواز

### ١. چەمکی کۆنی شێواز :

شێوز چەمكو مەفهومێکی کۆنی هەیە، لەسەرەتاوە بەگەلێ واتاو مەبەست بەکار هاتووە، لەلای گریکەکان چەمکی شێواز زیاتر پەیوەندی بەبابەتی زانستی ڕەوانبێژیەوە هەبووە تا هونەری شیعر، هیچ هۆیەکی دیارو تایبەتیش نەبووە بۆ ئەم دانەپاڵ ڕەوانبێژیەش تەنیا ئەوەنەبێ کە شێوازیان بەبەشێك لە هونەری قایل پێ کردن (اقناع) زانیووە[9]. لەبەر ئەم هۆیە بەگشتی باسکردنی شێواز لەگەڵ بابەتی دواندن (خطابە)دا هاتووە. ئەرستۆ لە وتاری سێیەمو هەشتەم، بنچینەکانی دواندنی کۆنتیلیان لەبابەت ڕەوانبێژی دەڵێ (لەدواندا دەبێ ئاگاداری ئەمانە بین : یەکەم هۆکارو کەرەستەکانی قایل پێ کردن، دووەم شێواز یان ئەو زمانەی کە بەکاردێ، سێیەم ڕێکخستنی وتەکان)[10]. ڕەوانبێژی کۆن جیاوازی لە نێوان بابەتەکانی هونەری دواندندا

---

[8] سبك شناسی، جلد آول ، ص د.

[9] الاسلوب و الاسلوبیه، ص ١٩.

[10] د. محمد غنیمی هلال، النقد الادبی الحدیث، بیروت، ١٩٧٣، ص١١٧.

کردووەو هەر بابەتەو جۆرە شێوازێکی تایبەتو جودای بۆ دیاری کردووە. هەر بابەتەو وشەو زاراوەیەکی تایبەتی خۆی هەیە و جیاوازە لە بابەتێکی دیکە[11].

بلوم فیلد لە وتاری (سیماکانی زمانەوانی لە زانستدا) دەڵێ (دیاردەیەکی دراو و باوەڕپێکراوی زمانەوانی ئەوەیە کە ئەگەر شێوەی دەربڕینەکان جیاواز بوون، هەمیشە واتاکانیش جیاواز دەبن[12]. ئەگەرچی واتاو مەبەستی شێواز لەکۆندا تەنیا لەچوارچێوەی دواندنو هونەرە رەوانبێژیەکاندا بوون، بەڵام لەوێشدا بێگومان هەر بابەتەو بەپێی جۆرو شێوەی خۆی جۆرە شێوازێکی تایبەتی هەبووە تەنانەت لە گفتوگۆی رۆژانەشدا هەر بابەتەو شێوەی دەربڕینێکی تایبەتی هەیە، هەر لەو سەرەتاییەوە بووە تێگەیشتنو بۆچوونەکان بەرامبەر بە شێواز وەك هەموو بابەتێکی تری ئەدەب و زانست گەشەی کردووەو لەو چوارچێوەیە دەرچووە بۆ واتاو چەمکێکی نوێ هەنگاوی ناوە.

### ٢. چەمکی نوێی شێواز :

لەماوەی سەدەی رابردوودا لێکۆڵینەوەو دراستی زمانو ئەدەب بە جۆرێك پەرەی سەندووە و گەشەی کردووە تا رادەیەك گەیشتۆتە پلەیەکی باڵا لە هەندێ توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زامانەوانیدا.

مێژووی زانستی زمانەوانی زنجیرەیەك لە هەوڵو تێکۆشانی ئەو زانایانەمان بۆ دەخاتە روو کە هەندێکیان لەپاش لێکۆڵینەوەکانیان دەگەڕانەوە سەر بەرهەمەکانیان و ئاڵو گۆڕی نوێیان تێدا دەکردو کەمو کورتیەکانیان تەواو دەکرد، بەمە گەشەیان بە کەرتە جیاجیاکانی ئەم زانستە دەداو بەرەو پێشیان دەبرد. لە ئەنجامی ئەم هەموو لێکۆڵینەوانەدا هەر زانایەك قوتابخانە و رێبازێکی زانستی زمانەوانی بنیاد دەنا، بۆ نمونە قوتابخانەی(بلومفیلد) قوتابخانەی جۆمسکی Noam Chomsky [13].

---

[11] بڕوانە ل ١٧ ی ئەم کتێبە.

[12] الاسلوب و الاسلوبیة، ص ٢٠.

[13] (بلوم فیلد) Loenard Bloomfield (١٨٨٧-١٩٤٩) یەکێکە لە زاناکانی زانستی زمانەوانی لە ئەمریکا.

لە سەرەتای شەستەکانەوە ، شۆڕش‌و گۆڕانێك بەسەر زمانەوانیدا هات لە ئەنجامی ئەو گۆڕانەدا قوتابخانەیەك هاتە کایەوە، بەناوی (قوتابخانەی دەرکدن‌و گواستنەوە = المدرسه التحويليه – التوليديه Transformational Genevatiove)14واتە پلەی ئیلتیزام‌و بەستنەوەی دەربڕینە زمانییەکان بە یاسا ڕێزمانییەکانەوە. هەروەها چۆمسکی لەبارەی (پلەی ڕێزمانی)یەوە کاریگەریەکی گرنگی هەبووە لەسەر لێکۆڵینەوەکانی زمانی ئەدەبی‌و هەروەها لەسەر لێکۆڵینەوەی شێوازو زمان، یان شێواز لە زماندا (Style in Language)[15]. بەپێی ئەم بیرانەی چۆمسکی بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم دەربڕین‌و گوزارشتانە لە چوارچێوەی ئەدەبدایەو لەناو ئەدەب ناچنە دەرەوە، لەبەر ئەوە لە ڕاستیدا چۆمسکی لە هەندێ لایەنەوە لە دەربڕینی ئەدەبیەوە نزیك دەبێتەوە[16].

دوا بەدوای ئەمان پێویستە سەرنج بدەین لە تازەترین گەشەی زمانەوانی، لەلای لێکۆڵەرەوەو زاناکانی بەریتانیا بەتایبەت لەلێکۆڵینەوەو توێژینەوەی دانەکانی زماندا هەروەها لە لێکۆڵینەوەی (گونجاندن‌و یەکخستنی وشەکان = توافقيه المفردات = Collocations)[17].

ئەم نمونەیەی خوارەوە لەڕێکخستن‌و ریزکردنی وشەکاندا، گونجان‌و جووت بوون نیشان دەدات هەروەها جیاوازی ڕێکخستنەکەش جیاوازیە لە واتادا .

نمونە:

**١. پیاوی درێژ**

**دیواری بەرز**

---

(چومسکی) (Noam Chomsky) زانای زمانەوانی هاوچەرخ گرنگی بەگەلێ لایەن داوە، زمانەوانی خستە ژێر تیشکی لۆژیك و فەلسەفە.

[14] روجر فاولر، نظرية اللسانيات و دراسة الادب، ترجمة د. سلمان الواسطي، الثقافة الاجنبية، العدد الاول، السنة الثانيية، ١٩٨٢، ص٨٣.

[15] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣.

[16] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٤-٨٥.

[17] روجر فاولر، نظرية اللسانيات و دراسة الادب، ترجمة د. سلمان الواسطي، الثقافة الاجنبية، العدد الاول، السنة الثانيية، ١٩٨٢، ص٨٣.

### ٢. پیاوی بەرز
### دیواری درێژ

ئاوەڵناوی دارێژراو بەرز لە یەکەمدا مەبەست سیفەتی بڵندیو بەرزییە بۆ دەرخراوەکە (وەسفکراوەکە)، ئەگەر ئاوەڵناوی بەرزمان لە جێگای درێژ دانا ئەوکاتە تایبەتیو رەوشتێکی تری (پیاو)ەکە دەردەخات. هەروەها (درێژ) بۆ دەرخستنی (دیوار) شێوەیەکی تر دەدات بەدیوارەکە (پیاوی بەرز) بەواتای شوێنو پلەو پایەی بەرز (مەرتەبە) دێ لەناو کۆمەڵدا نەك باڵای بەرزو درێژ. وەکو تانەو توانجیش بەکاردێ. دیواری درێژ بەواتای بەباری درێژیدا درێژە واتە ئاسۆیی نەك ستونی. لێرەدا ئاوەڵناوەکان تایبەتێتی (اتجاه) وەردەگرن.

ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەو گەشەکردنە بووە هۆی لابردنی هەندێ پەردەو تارمایی لەسەر رووی رێزمان لەکاتی ورد بوونەوەو وەسف کردنی دەربڕینە زمانییەکاندا. بەهۆی ئەم جۆرە لێکۆڵینانەوە چەمکی نوێی شێواز لەبەرهەمە ئەدەبیەکاندا هاتەکایەوە، توێژینەوەو تێروانینی شێوازگەریانە سەریان بۆ بەرهەمی شیعرو ئەدەب کێشا. (شێواز بەکارهێنانێکی دینامیکی خودیە وەك ئەوە وایە زمان کۆمەڵە بارکەیەکی لەیەك بچڕاوبێتو شێوازیش کارلێکردنیان لەنێواندا پەیدا بکات، ئەم کارلێکردنە وەك کارلێکردنی کەرەسە کێمیاویەکان وایە)[18].

لە ئەنجامی بۆچوون و رای ئەو رەخنەگر و لێکۆڵەرەوانەی لەمەڕ ئەم بابەتەوە بەرهەمی نوێ و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی زمانەوانیان لەسەر بەرهەمی شاعیراندا دەکرد، واتاو چەمکی شێوازیان لەروانگەی زمان و وشە و زاراوەکانەوە روون دەکردەوە و لە چۆنییەتی رێکخستن و دارشتنی ئەو وشانەوە سەیری بەرهەمی ئەدەبییان دەکرد، بەلای ئێمەشەوە لەگەڵ ئەو تایبەتیەی شێوازدا لە رووی وشە و زمانەوانییەوە، هونەرە رەوانبێژیەکان لەتواناو دەسەڵاتی شاعیردا رەنگ و خاسیەتی تایبەتێتی شێوازی شاعیر دەکێشن. چونکە شێواز لای شاعیر یان نووسەر لە ئەنجامی تەقینەوەی ئەو وزە پەنگ

---

[18] د. السلام المسدى، الاسلوبية و النقد الادبى، مجلة الثقافة الاجنبية، العدد الاول، السنة الثانيه، ١٩٨٢، ص ٣٦.

خواردووەوە دێ کە لە دوو توێی زماندا خۆی حەشارداوە و لە دنیای گریان و وای دابنێن قوتار دەبێ و سەردەکێشێ بۆ گێتی بەرفراوانی زمان و ئەدەب.

## پێناسەی شێواز

کورتە باسێکی هەندێ لەو هەولانەی لەوەوبەر دراون

زۆربەی لێکۆڵینەوەو باسە زانستیەکان لەبەر ئەوەی کە سنوری باسەکانیان دیاری کراوو بەرجەستە و ئاشکرایە، پێش هەموو شتێك پێنایە بۆ سەر باسی بابەتەکەیان دادەنێن و گەلێ پێناسەی جۆراو جۆر بۆ بابەتەکەیان دادەنێن، بەلام (شێواز) دژی هەموو پێناسە و شی کردنەوەیەکی تەقلیدی دەوەستێ.

(ریمی دی گۆرۆنت وا بۆ مەسەلەی شێواز دەچێ . . . و دەڵێ پێناسە کردنی شێواز وەکو ئەوە وایە فەردەیەك ئارد بخەینە ناو موستیلەیەکی درووماەوە)[19].

بەلام ئێمە لێرەدا وەك رێبازێکی لێکۆڵینەوەی زانستیانە لەپاش ئەم پێناسەیە چونکە بە گرنگی دەزانین دێینە سەر هەندێ لەو پێناسە و باسانەی کە لەبابەتە شێوازەوە کراوە.

لە فەرهەنگی ئەدەبی J.A.Cuddon دا بەم شێوەیە لە شێواز دوواون : شێواز، رێبازێکی دیاریکراوی دەربڕینە چ لە پەخشان و چ لە شیعردا، واتە نووسەرێکی دیاریکراو چۆن شتەکانی خۆی رادەگەیەنێ، چۆن ئەو زاراوانەی دەردەبڕێ.شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی شێوازی نووسەرێك یان وردبوونەوە لە چۆنێتی هەڵبژاردنی وشەکانی یان دەستەواژەکانی جگە لە کەرەستەکانی جوانکاری و رەوانبێژی . . . بۆ نمونە خوازە و لێکچوون یان شێوەی چۆنییەتی دارشتنی رستەکان ئاخۆ جوان و تۆکمەو ناسکن یان فش و فۆڵ و بێ رۆحن جگە لەشێوازی پەرەگرافەکان لەراستیدا هەموو دیاردە و دەستەواژەیەکی بەرجەستەی زمان دەگرێتەوە کە نووسەر بەکاری دەهێنێ.[20]

---

[19] J.A Cuddon, A Dictionary of Literary Terms, (London: Andre Deutsch, 1977) P.647

[20] J.A Cuddon, A Dictionary of Literary Terms, (London: Andre Deutsch, 1977) P647

کۆنترین سەرچاوەی عەرەبی کە لەم بابەتە دوابێت (موقەدیمەی) ئیبن خەلدوونە. بەم شێوەیە باسی شێواز دەکات : (شێواز بریتیە لەو مەکووکەی رستەی پێ دەتەنرێ، یاخود ئەو قاڵبەی کە تێی دەکرێ، ئەمە پەیوەندی بە قسەوە نییە کە مەبەستی ئەسڵی مانایە، چونکە ئەمەیان کاری ئیعرابە، هەروەها مەبەستی تەواوی ماناش نییە، کە لە خاسیەتەکانی تەرکیبە ئەمەش کاری رەوانبێژی و رەوانکاریە، هەروەها پەیوەندی بە کێش و قافیەشەوە نییە کە ئەمەش کاری عەروزە. ئەم سێ زانستە لەم هونەری شیعریە دەچێتە دەرەوە، بەڵکە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ وێنەی بیری (الصورة الذهبية)ی رستە، کە لە وشە یەکێتیەکی دروست کردووە، ئەمە لەگەڵ تەرکیبی تایبەتی رێك دەکەوێ. بیر ئەو وێنەیە لە کەس‌و تاکەکانی رستە وەردەگرێ لە خەیاڵی دەکا (واتە دایدەڕێژێ) وەك قاڵب یا مەکووك ئینجا رستەی راست لە عەرەب وەردەگرێ و رەچاوی ئیعراب و روونبێژیش دەکا. هەمووی لەوەدا ریز دەکا وەك ئەوەی بەننا لەگەڵ قاڵبی دەکا، تا قاڵبەکە پڕ دەبێ بە رستەی پێویست کە مەبەستی قسە دێنێتە دی بەشێوەیەکی راست کە لەگەڵ توانای زامانی عەرەبیدا بگونجێ. هەموو هونەرێکی قسە شێوازێکی تایبەتی خۆی هەیە.[21]

**لەو دەقەی سەرەوەدا دەتوانین سێ خاڵی سەرەکی گرنگ دەستنیشان بکەین :**

١.دوولایەنی لە پێکهاتنی شێوازدا جودا کردۆتەوە، ئەویش زانست کە بریتیە لە رێزمان‌و رەوانبێژی‌و عەروز ئەمانە لە رێکخستنی وتەکاندا بەکەڵکمان دێت، لایەنی دووەم لایەنە هونەریەکەیە کە شێوەی داڕشتنی شێواز دەگرێتەوە.

٢.شێواز لە ئەسڵدا وێنەی بیرییە، بیر ئەو وێنەیە لە کەس و تاکەکانی رستەوە وەردەگیرێ و دایدەڕێژێ.

٣. ئەم وێنە بیریە کە بنەمای سەرەکی شێوازە رستەیەکی سەربەخۆ یان واتایەکی دیاریکراو نییە، بەڵکو رێگایەکە لە رێگاکانی دەربڕین کە قسەکەر یان نووسەر دەیگرێ. عەبدول قاهری جورجانی لەمەڕ شێوازەوە دەڵێ : (شێوەی نووسین ، یا شێوەی ئینشا، یا شێوەی هەڵبژاردنی وشەو رێکخستنی وشەیە بۆ دەربڕینی مانا بۆ

---

[21] مقدمه ابن خلدون، القاهيره، ١٣٢٢هـ ، ص٣٢٦-٣٢٧.

مەبەستی روون کردنەوەو کارتێکردن یاخود جۆرە رێکخستنێکی نەزم (هەڵبەست = هۆنراوە) رێگەی دانانییەتی[22].

ئەحمەد شایب ئەم پێناسەیەی سەرەوەی بە چاك داناوە بۆ شێوازی ئەدەبی بە واتایەکی گشتی، بەڵام بۆ پێناسەی گشتی شێواز دەڵێ : (رێگای دەربڕینە) چونکە ئەم پێناسەیە گشتیە و هەموو زانست و هونەرەکانیش دەگرێتەوە، هەریەکەیان رێگاو رێبازێکی تایبەتی هەیە بۆ دەربڕین، کە هونەرمەندان پەیڕەوی دەکەن و شارەزاییان تێدا هەیە، وشەو کەرەستەکانو هۆکاریە بەرهەمهێنەرەکانو شێوەکانی لە ئاوازو رەنگو کەرەستەی هونەری بەکار دێننو دەیانکەن بەرێڕەو و رێباز بۆ دەربڕینەکانیان. هەروەها زاناکانیش لە رێبازی لێکۆڵینەوەی باسە زانستیەکاندا رەمز و هێمای تایبەت بە زانستەکانیانەوە بەکار دێنن بۆ دەربڕینی زانیارییەکانیان[23]. شێخ نوری شێخ ساڵح بەیەکەم کەس دادەنرێ لەناو نووسەرە کوردەکاندا کە باسی ئەم لایەنەی ئەدەبی کردبێ بۆ پێناسەی شێواز دەڵێ : (ئوسلوب بە ئەو تەرزی مەخسووسی بەیانییە دەڵێن کە هەر خەتیبێك یاخود هەر موحەرڕێك ئەوەی لە دەماغیایەتی ئیفادەی ئەکات، هەموو خەتیبێك مالیکی تەرزێکی مەخسووسی بەیانە)[24].

لێرەدا شێخ نوری شێواز بە تەرزی دەربڕینی ئەدیب دادەنێو زیاتر شێواز بە کەسایەتی ئەدیبەوە دەبەستێتەوە.

گومان لەوەدا نییە کە ئەم پێناسە و لێدوانە لە باسێکی وا زانستی وەك شێواز بەتایبەت لەو کات و سەردەمەدا سەرەتای سەدەی بیستەم هەنگاوێکی زانستیە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا و ئاوڕدانەوەیەکە لەم جۆرە زانستە و سەرەتای دەست پێ کردنی رەخنەی ئەدەبیە، چونکە لەوەو بەر هیچ سەرچاوەیەکی کوردیمان دەست ناکەوێ کە باسی شێوازی کردبێ.

بێگومان شێخ نوری ئەم وتارانەی لە ئەنجامی خوێندنەوەیەکی قووڵ و کەڵك وەرگرتن لە هەندێ سەرچاوەو کتێبی ئەدەبیەوە وەرگرتووە. خۆشی دان بەم راستیەدا

---

[22] عبدالقاهر الجرجاني، دلائل الاعجاز، بيروت، ١٩٧٨، ص٣٦١.

[23] أحمد شايب، الاسلوب، ط السادسة، القاهرة، ١٩٦٦، ص٤٤-٤٥.

[24] م. نوری، ادبيات كوردی، اسلوب چيه، ژيان، ذ.٤، ت٢، ١٩٢٦.

دەنێ لە وتارێکیدا دەڵێ : لەبەعزێ کتێبی ئەدەبیەدا ئوسلوب باعتبار. . . هتد[25].بەڵام ئەو سەرچاوانەی دیاری نەکردووە کەلەبەر دەستیان بوون و ناوی ئەو بەعزە کتێبەی نەهێناوە. د.کامیل بەسیر رای وایە کە سەرچاوە گەلێکی عەرەبی لەبەر دەستدایە [26] بەڵگەشی بۆ راکەی ئەوەیە کە زۆربەی ناونیشانی باسەکان لەبابەتی عیلمی مەعانی عەرەبیدا باسکراون، هەروەها دەڵێ شێخ نوری هەمیشە باسی وەرگێڕاو لە رەوانبێژیو فەساحەی عەرەبی بە چەشنێکی وشەیی تۆمار ناکات، بەڵکو گیانێکی تازە دەکا بەبەریدا[27]. ئێمە وای بەراست دەزانین کە ئەو کتێبە ئەدەبیانە بریتی بوون لە کتێبی مەنهەجی کە لە قوتابخانەی عوسمانییەکاندا خوێنراون، لەگەڵ چەند کتێبێکی ئەدەبی تورکی عوسمانی کە شێخ نوری خوێندویەتیەوە و کاریگەری هەبووە لەسەر رۆشنبیری شێخ نوری و بەشێوەیەکی زانستیانە کەڵکی لێ وەرگرتوون و بەشێوازی خۆی سەرلەنوێ دایڕشتۆتەوەو لەشێوەی چەند وتارێکی ئەدەبیدا بڵاویکردوونەتەوە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو وتارانەوەرگێڕانی کوتومتی ئەو کتێبە عوسمانیانەبن، هەروەها داهێنانێکی نوێش نییە لەلایەن شێخ نوریەوە، بەڵکو دادەنرێ بەبەرهەمێکی نوێی ئەدەبی کوردی لەژێر کاریگەری رۆشنبیری باوی ئەو سەردەمە، ئەم بۆچوونە نرخی بەرهەمەکە و پلەی بەتوانایی و کارامەیی خاوەنەکەی دەردەخاو خۆی کارێکی نوێ و زانستیانەیە کە بەو شێوەیە توانیویەتی ئەو بەرهەمە کە سەر بە رەخنەی ئەدەبین بێنێتە بەرهەم.

عەزیز گەردی بەم شێوەیە باسی شێوازی نووسین دەکا : (شێوازی نووسین برییتە لەو رێ و شوێن و رەنگ و روخسارەی کە نووسەر لە نووسیندا هەیەتی . ئەویش جۆری بیرکردنەوە و هەست و نەست و سۆز و گوداز و وشەبازی و دارشتنێکی وشە و هەرشتێکی دی دەگرێتەوە کە پەیوەندی بە نووسەر و نووسینەکەیەوە هەبێ) [28]، عەزیز گەردی لە بەرگی سێیەمی ئەو نووسینەیدا لەژێر ناونیشانی (شێوازی نووسین،

---

[25] م. نوری، ادبیات کوردی، اسلوب چیە، ژیان، ژ.٤، ت٢، ١٩٢٦.

[26] د. کامل حسن غزیز البصیر، شێخ نوری شێخ صالح لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی وێژەیی و رەخنەسازیدا، بەغدا، ١٩٨٠، ل٧٣.

[27] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

[28] عەزیز گەردی، رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی سێیەم، سلێمانی، ١٩٧٩، ل٩.

خەبەر و دارشتن)[29]، ئەم زانستە بەبەشی یەکەم لە چوار بەشی (واتاناسی) دادەنیٚ، لەگەڵ ئەوەی ئەم سیٚ بەرگەی رەوانبیٚژی لە ئەدەبی کوردیدا بە بەرهەمیٚکی رەوانبیٚژی بەکەڵك دادەنریٚ و بەگشتی باسی رەوانبیٚژی دەکا. بەڵام نەدەبوو زانستی شیٚواز بە بەشیٚك لە چوار بەشی یەکیٚ لە زانستەکانی رەوانبیٚژی لەقەڵەم بدات، چونکە شیٚواز خۆی زانستیٚکە و بەلای ئیٚمەشەوە وەك ئەحمەد ئەمین دەڵیٚ (یەکیٚکە لە چوار رەگەزەکەی ئەدەب)[30].بەپیٚی بۆچوونی ئیٚمە نووسەر و شاعیران بۆ ئەوەی شیٚوازی دەربڕینەکانیان چاك و رازاوە و کاریگەر بکەن و لەگەڵ ئەوەشدا تایبەتمەندی و جۆرە جیاوازیەکی پیٚوە دیاربیٚ پەنایان بردۆتە بەر بەکارهیٚنانی لایەنە رەوانبیٚژیەکان لەلایەکی دیکەوە عەزیز گەردی لە رەوانبیٚژی بەرگی سیٚیەمدا (ئاشکرایی) و (بەهیٚزی) و (جوانی) بەسیفەتەکانی شیٚوازی نووسین دادەنیٚ[31]، کەچی لە شیکردنەوەیاندا بەرەگەز و تەنانەت بە رەگەزی بنچینەی شیٚوازیان لەقەڵەم دەدا[32] .

ئەم تیٚکەڵی و جیاوازیانە و هەندیٚ لایەنی تری هونەری کە لە نووسینی ئەم بەرهەمەی گەردیدا بەکار نەهاتووە وا لە خویٚنەر دەکا کە وتە و بۆچوونەکانی (گەردی) لەگەڵ سەرچاوە و بنەما زانستیەکانی رەوانبیٚژی بە زەحمەت لە یەکدی جودا بکاتەوە.

دڵشاد علی لە نامەی ماجستیٚرەکەیدا (بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا)، لەباسی ریٚبازەکانی شیکردنەوەی بنیاتی هەڵبەستدا وەك یەکیٚ لە ریٚبازەکانی شیکردنەوەی هەڵبەست باسی ریٚبازی شیکردنەوەی شیٚوازی کردووە[33]، واتە شیٚوازگەری (الاسلوبیه) وەك لیٚکۆڵینەوەیەکی رەخنەیی تەنیا گرنگی داوە بە شیٚوازگەری وەك ریٚبازیٚکی رەخنەیی و باسی شیٚوازی ئەدەبی (الاسلوب)ی نەکردووە.

داود سەلوم کە باسی شیٚواز دەکا، تەنیا لە رووی شیٚوەو رواڵەتی دەرەوەی بەرهەمەکەوە شیٚواز دیاری دەکا، شیٚوازی نویٚ بە زادەی پیٚشکەوتن و گەشەی

---

[29] عەزیز گەردی، رەوانبیٚژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی سیٚیەم، سلیٚمانی، ١٩٧٩، ل ٩.

[30] احمد أمین، النقد الادبی/ ص٣٨.

[31] رەوانبیٚژی، بەرگی سیٚیەم واتاناسی، ل١٠.

[32] سەرچاوەی پیٚشوو، ل١٠-١١.

[33] دڵشاد علی، بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا، نامەی ماجستیٚرە پیٚشکەش بە کۆلیٚجی ئادابی زانکۆی صلاحدین کراوە، ١٩٨٨، ل٣٥.

نووسەرەکانی دادەنێ کە لە نووسینەکانیاندا موبالەغە و گوزارشتی رەوانبێژی و رازاندنەوەیان بەکارهێناوە، دەڵێ : نووسەرە نوێکان وازیان لەم شێوازە کۆنە هێناوەو رێگایەکی نوێیان دۆزیوەتەوە بۆ دەربڕینی بیرەکانیان ئەم گەشە و پێشکەوتنەش لە شێوازی ئاسان و وتەی رەوان و رووندا لە بەرهەمەکانیاندا دەردەکەوێ.[34]

جگە لەم لێکۆڵینەوەو دیاریکردنانە لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوە زمانەوانی و ئەدەبیەکانیشدا بەتایبەت لەلایەن ئەو زاناو لێکۆڵەرەوانەی سەر بە قوتابخانەی شێوازگەرین[35]، گەلێ پێناسەیان بۆ شێواز و شیکردنەوەی شێواز کردووە. ئێمە لێرەدا تەنیا چەند نمونەیەك لە بۆچوون و پێناسەکانیان دیاری دەکەین.

١. (( شێواز بریتیە لە کۆمەڵە سیفات و تایبەتێتیەك ، کە لە بەرهەمە جیاوازەکانی ئەدیبێك ، یان ئەدەبی ناوچەیەك یان سەردەمێکی دیاریکراودا (دووبارە دەبێتەوە)[36]). مونرۆ ١٩٥٦.

٢. ((شێواز بریتیە لە بەکارهێنانی زمان بەشێوەیەك کە لاسایی کردنەوە نەبێت و بەوشێوەیە زمان بەکار نەبرێت (دەرچوون لەشێوەی گشتی و باو) بەکارهێنانی زمان بەم جۆرە بەبەکارهێنانێکی شێوازگەری دادەنرێت))[37]. بیسلی.

٣. ((شێواز بریتیە لە لێکۆڵینەوەی رەگەزە کاریگەرەکانی زمان))[38]. چارلزبالی.

٤. ((شێواز بریتیە لەچۆنییەتی لێکدانی بەخشینە تاکەییەکان لەکارێکی هەستیدا و لە هەموو شێوەیەکی ممارەسەدا دەردەکەوێ))[39].

٥. ((شێواز لە رەخنەی ئەدەبیدا دەکاتە شێوەی تایبەتو جیای دەربڕین، لەگەڵ ئەو فیکرو بیرۆکەیەی کە گوزارشتی لێ کراوە بەمەرجێ کەسێتی (واتە دەنگی

---

[34] د. داود سلوم، تطور الفكرة و الاسلوب فی الادب العراقی، بغداد، ١٩٥٩، ص٧٧.

[35] بۆ نمونە لە وانەی سەر بەم رێبازە ئەدەبیەن : ا ی ١٠.ریچاردز، لیوسبتزر، اریخ ئۆارباخ، ولیم امبسون، فلوبیر، چارلز بالی، ستیڤن ئولمن، ماری بورون، دونالد یفی، داماسوالونسو.

[36] رولف ساندل، مفهوم الاسلوب، ترجمة لمیأ عبدالحمید العانی، مجلة الثقافة الاجنبیة، العدد الاول، السنة الثانیە، ١٩٨٢، ص٧٧.

[37] سەرچاوەی پێشوو، ص٧٦.

[38] گراهم هاف، السلوب و الاسلوبیة، ترجمة کاظم سعدالدین، بغداد، ١٩٨٥، ص٢٢.

[39] د. جوزیف میشال شریم، دلیل الدراسات الاسلوبیه، بیروت، ١٩٨٤، ص٣٧.

تایبەتی) نووسەرەکەی تێدا دەرکەوتبێ. هەروەك چۆن شەخسیەتی دوو مرۆڤ کتومت لەیەك ناکا. بەو یاسایەش دوو شێواز نییە کتومت لەیەك بکا، باشترین شێوازیش ئەوەیە کە زمانی دەربڕینەکە زۆر گونجاو بێ لەگەڵ ئەو بیروبۆچوونەی نووسەرەکە ویستویەتی بیگەیەنێ))[40].

((کۆمەڵێ سیفەت و تایبەتی هەیە وەك فەرهەنگی نووسەر، داڕشتنی زمان، رەوانبێژی، ئیقاع، مەنتقی نووسین (لۆژیکی نووسین). . . . هتد هەموو ئەوانە بەشێکن لە شێوازی نووسەرەکە))[41]

لە ئەدەبی فارسیشدا وەکو لەوەو بەر باسی لێوە کرا، سەبك = شێواز رێبازێکی ئەدەبی تایبەتە بۆ تێگەیشتن و تێگەیاندن[42]. جگە لەو پێناسەیە محمد تەقی بەهار زیاتر ماناو مەبەستی سەبك ڕووندەکاتەوە و دەڵێ : سەبك سیمای تایبەتی خۆی لەروانگەی رواڵەتو مانا، یا ناوەرۆك بە بەرهەمێکی ئەدەبی دەبەخشێ و پێی دەگەیەنێ و ئەویش بەنۆرەی خۆی لەگەڵ شێوەی بیر کردنەوەی وتاربێژ یان نووسەر سەبارەت بە راستی (حەقیقەت) پێوەندی هەیە. لەبەر ئەمانە سەبك بەواتای گشتی خۆی بریتیە لە پێکهێنانی لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی شێوەیەکی تایبەتی تێگەیشتن لە دنیای ئەدەبدا کە سروشتی بنەڕەتی بەرهەمی خۆی (شیعر یا پەخشان) دەنوێنێ و روونی دەکاتەوە.[43]

بەپێی ئەو سێ بەشەی کتێبی (سبك شناسی)و وەك نووسەرەکەی لەپێشەکیەکەیدا باسی لێوە دەکا ئەم زانستە لەلای ئەوان زۆر زۆر بەربلاو و فراوانە و شێواز لەلای ئەوان مێژووی ئەدەب و نووسین و خوێندن بە هەموو لقەکانییەوە دەگرێتەوە. تەنانەت لەژێر ناونیشانی (بەربلاوی و خۆگیری لەشێوازناسیدا) دەڵێ (هەر زانستێ کە لە هەموو شێوازە جۆراوجۆرەکانی زمانێك بکۆڵێتەوە و باسی هەموویان بکا شێوازناسی

---

[40] Coles Editorial Board, Dictonary of Literary Terms, (Toronto: Coles Publishing company Limited, 1980), P.194.

[41] سەرچاوەی پێشوو.

[42] بڕوانە ل٨ لەم کتێبەدا.

[43] محمد تقی بهار، سبك شناسی ، ص د.

پێدەگوترێ)[44]، هەروەها دەڵێ (ناتوانین شێوازناسی بەزانستێکی جیاواز و سەربەخۆ دابنێین، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێ بە زانستێکی تێکەڵاو لە زانست و هونەرە جۆراوجۆرەکانی بزانین کە زاڵ بوون بەسەر ئەوانە بەگشتی و توێژینەوەی ورد و تایبەتی ئەو زانستە پێك دێنێ)[45].

سەرجەم ئەم لێکۆڵینەوەو پێناسانەی کە بۆ شێواز کراوە ئەو ئەنجامەمان دەدەنێ کە هەرهەموویان لەوەدا یەکدەگرنەوە کە شێواز چەند تایبەتی و خاسیەت و رەگەزێکی هەیە ئێمە لێرەدا ئەو مەبەستە روون دەکەینەوە.

١.شێواز بریتیە لە رێکخستنی بیرەکانی مرۆڤ و جوڵانەوەی ئەو بیرانە لە هەندێ رستەی دیاریکراودا.

٢.شێوەی ئیدیۆلۆژی — ئیستاتیکی تایبەتی بەرهەمی نووسەرە، ئەمە لە هەموو بەرهەمەکانیدا دیار دەکەوێ و لە بەرهەمی تر جیایان دەکاتەوە.

٣.هەندێ جار بەخاسیەتی ئیستاتیکی بەرهەمی کۆمەڵك نووسەر دەوترێ، نەوەکو هی تاکە کەسێك، ئەوانەی روانینی وەك یەك لە ژیاندا کۆیان دەکاتەوە. ئەم یەکێتی شێوازە کە کۆمەڵە نووسەرەکە کۆدەکاتەوە رێباز، یا رێڕەو، یا (اتجاه)ی ئەدەبی پێ دەگوترێ[46]. هەروەها سنوری رێبازی ئەدەبیش دەکێشێ لە قۆناغێکی دیاریکراودا.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ، دەکرێ شاکارێکی ئەدەبی بەپێی قۆناغ و سەردەم بخرێتە خانەی خۆیەوە.

٤. شێواز لە زماندا بەکارهێنانی کۆمەڵێ وشە و زاراوەیە کە تایبەتییە بەو قۆناغ و رۆژگارە و بەو نووسەرە یا شاعیرەوە. لێرەدا هەڵبژاردنی وشە و گونجاندنیان لە رستەکاندا و رازاندنەوەی رواڵەتی وشە و دەربڕینەکانیش دیاری دەکا.

بەکورتی دەتوانین ئەم پێناسەیە بۆ شێواز دیاری بکەین :

---

[44] محمد تقی بهار، سبك شناسی ، ل: و، ز.

[45] سەرچاوەی پێشوو، ل: و، ز.

[46] بڕوانە رێبازە ئەدەبیەکان وەك : سینتیمینتالیزم، سیمبۆلیزم، فۆتۆریزم، . . . هتد.

**شێواز بریتیە لە ڕێگایەکی تایبەت کە نووسەر یا شاعیر بەهۆیەوە لە دارشتنێکی تایبەت بە خۆی و زمانەکەیەوە، بیرەکانی پێ دەردەبڕێت.**

ئەم پێناسەیەبە پێناسەیەکی تەواو دادەنێین چونکە هەموو ڕەگەز و تایبەتیەکانی شێوازی تێدایە.

## شێواز و بابەت

وەك لە باسی واتا و چەمکی کۆن و نوێی شێوازدا دیاریمان کرد کە شێواز لە نواندن و گەلێ هونەری تریشدا جیاوازە، بێگومان جیاوازی بابەتەکان دەبنە هۆی جیاوازی شێوازەکانیشیان. لەبەر ئەمە شێوازی دەربڕین و گوزارشت کردن بەپێی بابەت دەگۆڕێ و جیاوازی هەیە لەنێوان شێوازیك و شێوازێکی تردا،

ئەم جیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی گرنگ :

یەکەم : بابەت

دووەم : ئەدیب (نووسەر و شاعیر)

### هۆی یەکەم : بابەت

بابەت هۆی یەکەم و سەرەکیە کە جیاوازی شێواز دەردەخا، مەبەست لە بابەت ئەو هونەرەیە کە نووسەر یا شاعیر هەڵیدەبژێرێ بۆ دەربڕینی و گوزارشت کردن لەو بیر و مەبەستانەی لە دەروونیدایە، ئەو هونەرە چ زانست بێ یا ئەدەب، شیعر یا پەخسان، بۆ هەر یەکە لەو هونەرانە شێوازێکی تایبەت هەیە کە دەگونجێ لەگەڵ جۆرو سروشتی بابەتەکەدا[47]. وەك ئاشکرایە دەربڕینی بیرەکان لە هەر بابەتێکدا بێت بەهۆی زمانەوەیە. لەبەر ئەمە بەلای ئێمەشەوە وەك J.A.Cuddon لە فەرهەنگی ئەدەبیەکەیدا بەپێی زمان شێوازی جیا کردۆتەوە، کە بریتیە لە زانستی ، شیعری، ڕۆژنامەگەری[48].

---

[47] احمد شایب، الاسلوب، ص٥٤.

[48] J.A.Cuddon, A Dictionary of Literary Terms, P.647.

بە گشتی سەرەتای جیابوونەوەی شێواز لەرووی بابەتەوە لە جیابوونەوەی زانست و ئەدەبەوە دەست پێ دەکات. ئەم نەخشەیە ئەو جیاوازیانە روون دەکاتەوە: 49




لەو خشتەیەدا جیاوازی شێواز لە جیابوونەوەی هەردوو بابەتە سەرەکیەکەوە دەستی پێ کردووە. کە بریتین لە زانست و ئەدەب، هەرچی شێوازی بابەتە زانستیەکانە کۆمەڵێ زاراوەو وشەگەل دەگرنەخۆ کە تایبەتن بەو زانستەوە کە نووسەرەکەی لێی دەدوێت، بۆ نمونە لە زمانی زانستە بەرجەستەیەکاندا وەك (پزیشکی، ئەندازیاری، فیزیك، کیمیا، ماتماتیك،. . . هتد) هەندێ وشە و زاراوەو فرێزێکی تایبەت بەو زانستە دووبارە دەبنەوە، بەڵام دەبینین لەدەرەوەی ئەم بوارانەدا، ئەم جۆرە وشانە بەکارنایەن یان زۆر بەکەمی بەکاردێ. لەبارەی مەبەستیشەوە شێوازی زانستی بەهۆی ئەوەوە کەبە مەبەستی فێرکردن و پێشکەش کردنی بابەتێکی زانستیانە و کەرەستەی بابەتەکەش مەتریاڵ و کەرەستە بەرجەستەکانە، دەبێ شێوازی نووسین و دەربڕینەکان دوور بێ لە خەیاڵ

---

49 احمد شایب ئەم نەخشەیەی بەکار هێناوە بەڵام لە بەشی شیعردا بەشەکانی بەپێی مەبەست دیاری نەکردووە. بڕوانە احمد شایب، الاسلوب، ص٥٥.

و هەست و سۆزەوە، بەهۆی ئەم بابەتەشەوەیە کە بە زمانی زانست دەڵێن (زمانی هۆش ، یان ئەقڵ)[50].

وەك زانراوە زانا بیر لە دەنگ و واتای جیاوازی نێوان دەنگەکان و وشەکان ناکاتەوە، بەڵکو تەنیا بیر لە واتا هۆشیەکانی دەکاتەوە، وشە لەلای ئەو هیچ ئەرکێکی تری نییە جگە لە گەیاندنی واتا زانستی و لۆژیکیەکەی نەبێ. شێوازی زانستیش بەپێی جیاوازی مەبەست و تایبەتێتی لقە جیاوازەکانی زانست دابەش دەبێ بە چەند جۆرێکەوە، هەر جۆرە و شێوازێکی جودای هەیە، لێرەدا بەپێویستی نازانین لەمە زیاتر لەم بابەتە بدوێین.

## هۆی دووەم : ئەدیب (نووسەر و شاعیر)

لێرەدا بەکورتی باسی هۆی دووەم دەکەین، بێگومان تا ژمارەی شاعیر و نووسەر زۆر بێت بەقەدەر ئەوە شێوازیان جیاواز دەبێ، بەڵگە نەویستە کە مرۆڤ لە بیرکردنەوەو دەربڕین و تەنانەت لەشێوەی ئاخاوتن و هەڵسوکەوتەوە وەك یەك نین، بەڵکو باری دەروون و رەوشت و هەڵسوکەوتی کەسانی کۆمەڵ جیاوازە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە. لەبەر ئەمە دەبێ شێوازی ئەدیب و شاعیرانیش چوون یەك نەبێ و جیاوازییان لەنێواندا هەبێ. ئەم جیاوازییەش لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ گەلێ هۆ وەك کەسایەتی و خودی نووسەر یا شاعیر، لەرووی زەوق و بەهرەو مەوهبەو خوڕەوشتی نەرم و لەسەرخۆ یا ناسك و بەسۆز، یا بەپێچەوانەوە ئاڵوز و هەڵچوونی دەروونی و بێ ئارامی و گەلێ خوو نەریتی تر. بەشێکی تایبەتی شێواز پێکهاتووە لە میزاج و رەوشت، خۆیەتی نووسەر[51] پێوەندی نێوان ئەم خورەوشت و نەریتانە و کاریگەرییان لەسەر باری دەروونی نووسەر یا شاعیر بێ شك کار دەکاتە سەر چۆنێتی بیر کردنەوەو دەربڕین و گوزارشت کردن لەو بیرانە، لەلایەکی تریشەوە کەسایەتی نووسەر یا شاعیر باری ژیانی رۆڵێکی گرنگ و سەرەکی هەیە لە جۆرو شێوازی دەبڕینەکانیدا. لەبەر ئەمە شێواز بە فێربوون یا خوێندنی رەگەزو بنەماکانی شێواز

---

[50] احمد شایب، الاسلوب، ص٥٩.

[51] سلامە موسی، الادب للشعب، قاهرە، سنە ؟ ، ص١٥٩.

دیاری ناکریّ[52] یاخود هیچ شاعیریّ خاوەن شێوازێکی سەرکەوتوو تایبەت بە خۆیەوە نابیّ ئەگەر هاتوو لاسایی شاعیرو نووسەرێکی تری کردەوەو شێوازی تایبەتیو کەسایەتی خۆی بە بەرهەمەکانییەوە دیار نەبوو.

بەکورتی دەتوانین بڵێین شێواز بەتەنیاو بیّ پێوەندیە کەسایەتیەکانی شاعیر نابیّ، بەڵکو لەژێر کاریگەری ئەو پێوەندیانەدایە، و گەلیّ هۆی کەسی و دەوروبەر و کۆمەڵ و باری ژیان و چینایەتی و رادەی رۆشنبیری و . . . هتد دەبنە هۆی جیاوازی و تایبەتی شێوازی شاعیرێك یا نووسەرێك لەگەڵ ئەوانی تردا.

## شێوازی ئەدەبی

بابەت و بەرهەمە ئەدەبیەکان چونکە پێوەندن بە هەست و سۆزی مرۆوە، تەعبیرو گوزارشتکردن لەم بابەتە خەیاڵ ئامێزە و عاتیفە و سۆز هەوێن و کرۆکی بابەتەکە دەبیّ، ئەمانە جێگای بیرە راستیەکانی زانست دەگرێتەوە لەبەرهەمی زانیاریدا.

ئەو زمانەی کە ئەو بەرهەمە ئەدەبیانەی پیّ بنوسریّ دەبیّ زمانێکی سۆزی و هەستی بیّ. زمانی ئەدیب و شاعیران سروشت و تایبەتێتیەکی هەیە کە هەست و سۆز دەجولێنیّ و بە وشە و زاراوەی ئاوازەدار و نەغمە و دەنگی مۆسیقی گوزارشت لە بیرەکانیان دەکەن، شاعیر لە بەرهەمەکانیدا پەنا دەباتە بەر هەڵبژاردنی وشەی بەهێز و کاریگەر، بەشێوەیەك کە لە تەك مەبەستەکانیدا بگونجیّ بەپێی شوێنی وشەکان هێز و نرخیان پیّ دەبەخشیّ، هەر لێرەوە ئەو بایەخ و نرخە دەردەکەویّ کە دەدریّ بەو هەڵبژاردن و گۆڕانکاریانەی بەسەر وشە و زاراوەکانیان دێنن. شاعیر و نووسەران بەم کارەیان شێوازێکی تایبەت و دیار بەخۆیان و بەرهەمەکانیانەوە دیاری دەکەن.

تا رادەیەك ئەم هەڵبژاردن و تاوتویّ کردنی وشەیە لەلای شاعیر و نووسەران بایەخی پیّ دەدریّ، وا لە رەخنەگرانی ئەدەب دەکەن کە بایەخ بدەن بە هەمەلایەنی واتاکان یا (فرە مانایی تێکستە ئەدەبیەکان).

---

[52] سلامە موسی، الادب للشعب، قاهرە، سنە ؟ ، ص١٦٢.

فلۆبیر یەکێکە لە رۆمان نووسە فەرەنساییەکان و بەمامۆستایەکی رێبازی شێوازگەری دادەنرێ، لە نووسینەکانیدا بەشێوازی جوان و رەونەقدار ناسراوە، ئەوەندە گرنگی بە هەڵبژاردنی وشە و زاراوەکان دەدا تا ئەو رادەیەی رەخنەگرەکان بەرهەمەکانی فلۆبیریان دادەنا بەکارێکی لێکۆڵینەوەو پشکنین و گەڕان بەدوای وردەکاریدا[53].

تەنانەت هەندێکیان ئەم شێوازەی فلۆبیریان بە نەخۆشیەك دادەنا ، فلۆبیر لەبارەی شێوازەوە دەڵێ (( چەند بیر جوان بێ هێندەی ئەوەش دەبێ رستەکان ئاوازەدار بن، بڕوام پێ بکەن وردی بیر خۆی بەتەنیا لە وردی وشەوە سەرهەڵدەدات))[54].

بەم پێیە بەشێوەیەك روون بۆتەوە کە وشەکان لەنێوان خۆیاندا بەسەر یەکتری بەرز نابنەوە تەنیا لەبەر ئەوەی وشەی رووتن یاخود وشەی بەتەنیان، بەڵکو جوانی و بەرزی وشە یان ناشرینی و نزمی وشە لەوەدایە کە مانای وشەیەك لەگەڵ مانای وشەی دوای یا پێش خۆیدا رێك بکەوێ، بەڵگەی ئەمە هەندێ جار تۆ وشەیەك دەبینی بە دڵت دەبێ و پێت خۆش دەبێ لە جێیەك، لەپاشانا هەر ئەو وشەیە قورس دەبێ و پێت ناخۆش دەبێ لەشوێنێکی تردا.

بەم شێوەیە دەبینین شاعیر یا نووسەر زمانێکی ئەدەبی بەکار دێنێ جیاوازە لەگەڵ ئەو زمانەی کە زانستی پێ دەنوسرێ و جیاوازیشە لە زمانی خەڵکی کە لە ژیانی رۆژانەدا بەکاری دەهێنن، وەك لەوەو بەر وتمان زمانی زانست (زمانی عەقڵە) زمانی ئەدەبیش (زمانی هەست و سۆزە).ونفرید ناووتنی -Winifred Nowottny- لە کتێبێ (ئەو زمانەی شاعیران بەکاری دێنن)دا -The Language Peets use- دەڵێ ( جیاوای سەرەکی لە نێوان زمانی شیعر و زمانی دەرەوەی شیعردا ئەوەیە کە لەیەکەمیاندا یاسا و ئەحکامی بونیادگەری – ستراکجرالیزم زیاتر دەچەسپێ تا لە دووەمدا )[55].

---

[53] رشيد احمد التركي، فلوبير نظرة في اسلوبه الفني، الموسوعة الصغيرة، ١٣٢، بغداد، ١٩٨٣، ص٤٧.

[54] سەرچاوەی پێشوو، ص٤٨.

[55] روجر فاولر، نظريةاللسانيات ة دراسة الادب، ترجمة د. سلمان الواسطي، مجلة الثقافة الاجنبية، العدد الاول، ١٩٨٢،ص٨٧.

کەواتە شێوازی ئەدەبی بەکارهێنانی زمانە بەشێوەیەك کە لە دەردوەی بابەتە ئەدەبی و بەرهەمە شیعریەکاندا بەو شێوەیە بەکار نەبرێت، هەروەها شێواز جیاوازیشە لە بەکارهێنانی زماندا ئەم جیاوازیەش لە هەموو ئەدەبدا چوون یەك نییە وەك لە باسی شێواز بەپێی بابەتدا دیاریمان کرد و لە نەخشەکەدا دەردەکەوێ کە شێوازی ئەدەبی دوو بەشە، بەشی یەکەم پەخشان[56] و بەشی دووەم شیعر. پەخشانی ئەدەبیش چەند بەشێکی هەیە بێگومان هەر یەکە لەو بەشانەش شێوازو شێوەی دەبڕینیان جیاوازە، نامانەوێ لێرەدا بەدرێژی بچینە ناو باسی شێوازی پەخشانەوە[57]، تەنیا بەکورتی باس لە جیاوازی نێوان هونەرە ئەدەبیەکان دەکەین کە بە پەخشان دەنوسرێن بۆ نمونە شێوازی چیرۆك نووسین لەگەڵ شانۆگەری و نامە و وتاردا جودایە و هەریەکە بەپێی بابەتی خۆی شێوازێکی جیاوازی هەیە.

لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە جگە لە شیعر هەموو دەقێك یان هەر نووسینێك لەشێوەی پەخشاندا بێت هونەری بێت یا نا، شێوازێکی سەربەخۆی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ نمونە گۆشەی (بەرنامەی کورتەی هەواڵەکان) یان (بۆ ئاگاداری)و بۆ زانین لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا شێوازێکی تایبەتیان هەیە دەبینین لەم جۆرە نووسینانەدا بەچڕی ناوی ناسراوی تیا بەکار دەهێنرێ ئەمە شێوازێکی تایبەتە بەو جۆرە باسانەوە کە لە شیعر و نووسینی تردا بەرچاو ناکەوێت.

بەشەکەی تری ئەدەب کە بریتیە لە شیعر، بێگومان ئەمیش گەلێ جۆری هەیە هەر لە کۆنەوە شیعریان بەپێی مەبەست جیاکردۆتەوە، لەجیاکردنەوەو دابەشکردنی شیعر بە پێی مەبەستدا زۆربەی لێکۆڵەرەوانی ئەدەب ئەم سێ جۆرەیان دیاری کردووە:

١. شیعری گۆرانی (لیریك) یان ویژدانی.
٢. شیعری مەلحەمی (داستان)
٣. شیعری شانۆگەری.

---

[56] مەبەستمان لە پەخشان تەنیا پەخشانی ئەدەبیە.

[57] بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە : عەزیزی گەردی، پەخشانی کوردی، هەولێر، ١٩٨٧، (کتێبێکی مەنهەجیە) ، عەلائەددین سجادی، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، بەبغدا،١٩٧٨.

بێگومان شێوازی هەر جۆرێکیان تایبەتە بە خۆیەوەو ئەمانیش هەریەکەیان بۆخۆیان شێوازی گونجاوو جیاوازیان هەیە کە بەپێی بابەتەکانیان دەگۆڕێن.

دیارە شیعریش بەتایبەت شیعری گۆرانی کە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا تەنیا ئەم جۆرەیان بەتەواوی هەیە مەبەستی سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیەمانە، کە دەڵێین شیعر مەبەستمان شیعری کلاسیکیی کوردیە و بەتایبەت بەرهەمی شیعری سەردەم و قۆناغێکی مێژوویی دیاری کراو کە بریتیە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم لێکۆڵینەوەکەمان شێوازی شیعری کلاسیکیی ئەو سەردەمە لەسەر بەرهەمی شیعری سێ شاعیرە کە ئەوانیش (نالی، سالم، کوردی)ن.

چونکە وەك لەم بەشەدا روونمان کردەوە ، شێواز لە سەردەمێکی دیاریکراودا سنوری رێباز و قوتابخانەیەکی ئەدەبی دەکێشێ. تایبەتیە مێژوویی و خاسیەتە زمانەوانییەکانی ئەو قۆناغە و باری ژیانیان و یەکێتی روانینیان بۆ ژیان شێوازێکی یەکگرتوو دەنەخشێنێ ئەم بابەتە لەبەشی دووەمی ئەم نامەیەدا شێوازی ئەو قوتابخانە شیعریە لەناوچەی سلێمانیدا روون دەکاتەوە.

هەرچی شێوازی تایبەتی هەریەکە لەو شاعیرانەیە لە رەگەزە تایبەتیەکانی شێوازی ئەدەبی دیار و تایبەت بە هەریەکە لەو سێ شاعیرە لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا دەبینرێ.

## شێوازی شیعری کلاسیکیی کوردی

**سەرەتا :**

پێش ئەوەی بچینە ناو باسی شێوازی ئەم قوتابخانەیە، بە پێویستی دەزانین کورتە باسێکی مێژوویی بگێڕینەوە سەبارەت بەو میرنشینەو دەسەڵاتەی لەو سەردەمە دیاریکراوەدا هەبووە، لەگەڵ کورتە باسێکی مێژوویی لە بابەت دروست کردنی شاری سلێمانییەوە، چونکە ئەمانە ڕووداوێکی مێژوویی گرنگ بوون و ڕۆڵێکی سەرەکیان هەبووە لە دروست بوونی قوتابخانەیەکی ئەدەبی کە بە قوتابخانەی ناوچەی سلێمانی (بابان) دەناسرێت و تائێستاش هەر بەردەوامە و ئەو سێ شاعیرەی کە دامەزرێنەر و رابەری ئەم قوتابخانە ئەدەبیە تازەیە بوون لەم مەڵبەندەوە سەریان هەڵداوە.

لەم بەشەدا ئەم لێکۆڵینەوەیە یەکێکە لە ڕێگاکانی لێکۆڵینەوەی شێوازی کە بەرێگای لێکۆڵینەوەی شێواز لەرووی مێژووییەوە دادەنرێ، هەروەها ئەو گۆڕان و گەشەیەی کە لەم ناوچەیەوە دەستی پێ کردو پەرەی سەند بەرەو زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو هەنگاوی ناو بوو بەبنەما و بنچینەی ئەو زمانە ئەدەبیەی ئێستامان.

## میرنشینی ناوچەی سلێمانی

مێژووی ئەم میرنشینە کۆنە، دەگەڕێتەوە بۆ پێش دروست کردنی سلێمانیو قەڵاچوالانیش، هەروەها گەلێ سەرچاوەی مێژوویی و داستان و مێژوو نووس دەربارەیان دوواون. کۆنترین سەرچاوە کە باسی بنەماڵەی ئەم میرنشینەی کردبێ، شەرەف نامەی شەرەفخانی بدلیسی یە. ئەمیر شەرەفخان دەڵێ ((ئەم بنەماڵەیە (خێزانی بابانییەکان) لەکوردستاندا لە هەموو میرەکانی تری کوردستان بەناو دەنگتر و بەهێز و خاوەن دەسەڵاتتر بوون و کەسی لەهاوچەرخیان هاوسەنگیان نەبووە. بەڵام لەدوای ئەوەی کە فەرمانداری ئەو خانەدانە بە پیربۆداقی بەبەیی و براکەی گەیشت، ئیتر پاش ئەمان

دەست و پێوەندەکانیان بونە جێگرو ناوی بابانیان بۆ خۆیان گرتەوە))[1]. دوابەدوای ئەمە میر شەرەفخان باسی میربۆداقی کوڕی ئەبدال بەگ دەکا و زۆر وەسفی ئازایەتی و پیاوەتی و سوارچاکی و دەسەڵات داری دەکا و دەڵێ ( کار گەیشتە بارێ کە هەوای دەرکەوتن و سەرکەوتنی کەوتە سەرو زۆریش سەرکەوت مەڵبەندی لاهیجانی داگیرکرد سێوی ی[2] لە سۆران جودا کردەوەو سندسی لە قزڵباش پاکردەوە و قەڵای مارانی وك جارانی پێشو سازدایەوەو بەمیر لیوای خۆی سپارد و هۆزەکانی موکری و بانەی خستە ژێر فەرمانی خۆی، شارباژێڕی داگیرکرد))[3].

ئەمە سەرەتای مێژووی دووسەد ساڵەی ئەم میرنشینەیە و سەرچاوە مێژووییەکان تا ئێرە دادەنێن بە بنەماڵەی یەکەمی خێزانی بابانییەکان[4].

بەکورتی خێزانی دووەم لە دوای کۆچی دوایی (بۆداق بەگ) کوڕی رۆستەم بەگ فەرمانڕەوایی وڵاتی بەبە دەکەوێتە دەست پیرنەزەر (نظر)ی بارام کە یەکێك بوو لە ئەمیرەکانی پیربۆداق بەبە.

بنەماڵەی سێیەم و چوارەم لەدوای پیرنەزەر وڵاتی بەبە کەوتە دەست دوو ئاغای پیر بۆداق بەبە ئەم دوو ئاغایە میر سلێمان و میر ئیبراهیم بوون[5].

بەڵام بنەماڵەی پێنجەم یان دوابنەماڵەی ئەم میشرنشینە[6] لە فەقێ ئەحمەد ناوێکەوە دەست پێ دەکات کە لە دارەشمانەوە سەری هەڵداوە، دارەشمانە گوندێکە سەر بە قەزای پشدەری پارێزگای سلێمانییە و چەند کیلۆمەترێك لە قەڵادزێوە دوورە، ئەم فەقێ ئەحمەدە کوڕی کاکە شێخە کە ناوچەی مەرگەی بەدەستەوە بووە، لەدوای

---

[1] شەرەفخانی بدلیسی، شەرەفنامە، هەژار، بەغدا، ١٩٧٣، ل٥١٨-٨١٩.

[2] سەرچاوەی پێشوو، (وەرگێڕ — هەژار لە پەراوێزدا دەڵێ : دەبێ (سێوی) سیوەیل یان زێوە بێ)

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٥١٩.

[4] بڕوانە : ١/ محمد أمین زکی، تأریخ سلیمانی و ولاتی، بغداد،١٩٣٩ن ل٣٦-٣٧.

٢/ جەمال بابان، السلیمانییە من نواحیها المختلفە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، بەرگی هەشت، ١٩٨١، ل٣٣٦.

٣/ الدکتور عبد العزیز سلیمان نوار، تأریخ العراق الحدیث، القاهرە، ١٩٧٨.

[5] تأریخ سلێمانی و وڵاتی، ل٣٨، هەروەها بڕوانە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، بەرگی(٨)، ل٣٣٦.

[6] سەرچاوەی پێشوو.

ماوەیەك بابامیر کاکە شێخی برای دەکوژێت، ژنەکەی کاکە شێخ لەگەڵ کوڕەکەیدا رادەکەن بۆ ناوچەی بتوێن بۆ ناوچەی خدران. لەوێ نیشتەجێ دەبن تا فەقێ ئەحمد گەورە دەبێ، ئینجا دایکی سەرگوزشتەی کوشتنی باوکی بۆ دەگێڕێتەوە و هانی دەدا بۆ تۆڵە سەندنی باوکی شەوێك دەدا بەسەر مامیا دەیکوژێو دەست دەگرێ بەسەر ناوچەی پشدەردا[7]. ئەم داستانە بەم شێوەیە لە ناوچەی پشدەر دەماودەم دەگێڕدرێتەوە، رەمزی قەزاز ئەم شێوەیەی لا پەسەندە، لەبەر ئەوەی دەچێتە سەر نووسینەکانی مێژوو نووسانی وەك محەمەد ئەمین زەکی بەگ و جەودەت پاشا. ناوی داستانەکەی لەسەر ئەم داستانە دارِشتووە بە داستانی دوو پاڵەوان. فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە و کەیغانی فەرەنگ[8]. هەرچی شێوەکەی تری ئەم داستانەیە شێوەکەی کلۆدیوس ریچە کە لە ساڵی ۱۸۲۰ز. لە سولەیمانی بووە لە حوزوری مەحموود پاشا لە یەکێ لە پیاوە پیرەکانی دێی دارەشمانەی بیستووە کە ناوی ئەحمەد بەگ بووە و لە تەمەنی۹۲ ساڵیدا بووە ئەم داستانەی لە زمانی ئەو ئەحمەد بەگەوە وەرگرتووە[9].

لەپاش فەقێ ئەحمەد، بابا سلێمانی کوڕی لە ناوچەی پشدەرو خان بداق لە ناوچەی ماوەت فەرمانڕەوایی دەکەن. لونگریك دەڵێ ((ئەم باباسلێمانە کوڕی ماوەندە و ماوەند کوڕی فەقێ ئەحمەدە، ئەم سلێمان بەگە بە دامەزرێنەری راستەقینەی میرنشینی بابان دادەنرێ و لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەمەوە ئەم پیاوە ناودار و خاوەن دەسەڵات بووە و تاکە پیاوێك بووە لە شارەزووردا ))[10] لەسەردەمی ئەم میرەدا مەڵبەندی میرنشینەکە لە دارەشمانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ قەڵاچوالان، ۱۰۸۰ھ/۱٦٦۹ زپاش ئەوەی ماوەیەك ماوەت مەڵبەندی ئەم میرنشینە بووە[11]. لەپاش ئەم تەیمورخان بەگ جێی دەگرێتەوەو لەپاش ئەمیش بەکر بەگ دەبێ بە فەرمانداری میرنشینەکە و لەسەردەمی ئەم میرەدا کە بە بەکرە سوور ناوبانگی دەرکردبوو سنوری میرنشینەکەی

---

[7] رەمزی قەزاز، داستانی دوو پاڵەوان، فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە و کەیغانی فەرەنگ، بەغدا، ۱۹۷۸،ل۸-۹

[8] سەرچاوەی پێشوو.

[9] تأريخ سلێمانی و وولاتی، ل٥٤.

[10] ستيفن هيمسلي لونطريك، آربعة قرون من تأريخ العراق الحديث، ترجمة جعفر الخياط، الطبعة الرابعة، بغداد، ۱۹۷۸، ص۱۰٥.

[11] تۆفیق قەفتان، مێژوو حوکمدارانی بابان لە قەڵاچوالان، بەغدا، ۱۹٦۹، ل۱۷.

فراوان کرد بوو، گرنگی دەدا بە ئاوەدانکردنەوە و بنیادنانی پڕۆژەی ئاوەدانی، لەوانە جۆگەی بەکرەجۆ و گردی بەکراوای نزیك شاری هەڵەبجە بەناوی ئەم میرەوەیە[12] قەڵاچوالان لە ۱٦٦۹-۱۷۸۸ زایینی مەڵبەندی میرنشینەکە بوو، لەم ماوەیەدا گەلێ میر و پاشا فەرمانڕەواییان کردووە تیایاندا بووە بۆ جاری دووەم و سێیەم دەهاتە سەر فەرمانڕەوایی، ئێمە لێرەدا نامانەوێ لەم رووەوە درێژەی پێ بدەین. بەڵام ئەوەی گرنگە و پێویستە بوترێ کاریگەری و رۆڵی ئەو سەردەمەی ئەم میرنشینەیە لەسەر رۆشنبیری و ئەدەبی کوردی، لەگەڵ ئەو هەموو رووداوە پڕ مەینەت و شەڕ و شۆڕ و کوشت و بڕەی چ لەنێوان میرەکانی بابان خۆیاندا و چ لە ئەنجامی هێرش و پەلاماری دوژمنانەوە بووبێ بۆتە هۆی وێران بوون و داگیرکردنی مەڵبەندەکە و کوشت و بڕ و کارەسانی ناهەموار، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو ناخۆشیەشدا میرەکان هەریەکە و لەلای خۆیەوە خزمەتی رۆشنبیری و ئەدەبی و زانستی کردووە. شێخ محمدی خاڵ لەبارەی زانست و خوێندەواری و چۆنییەتی ژیانی قوتابیانەوە و جێگاو رێگاو بەرەی پیاوانی ئایینی و زاناو نووسەرەکانەوە زۆر وەسفی ئەو مەڵبەندە دەکات[13] لەبارەی کتێبخانەی بابانەوە دەڵێ ((کتێبخانەی بابان)) ناوبانگی دەرکردبوو، گەلێ دەست نووسی نایابی عەرەبی و فارسی تێدابوو، نزیکەی شەش هەزار بەرگ کتێبی نایابی تێدابوو، هەروەها دەستخەتی زۆری تێدابوو کە بە پێنووسی نووسەرەکان خۆیان نوسرابوونەوە،میرە بابانییەکان زانستیان خۆشدەویست و رێزی شاعیر و ئەدیبیان دەگرت، قوتابخانە و مزگەوتیان بنیاد دەنا، هەر مزگەوتە و زانایەکی ئایینی بەڕێوەبەرایەتی دەکرد، کۆمەڵێگی گەورە لە پیاوانی ئایینی و زانا و ئەدیب و شاعیر لەوێدا پەیدا بوون و پەرەیان سەند وەك بەرزنجیەکان، جوریەکان، کاردۆخی و قزلجەیەکان[14] سەردەمی سلێمان پاشای بابان بە سەردەمێکی زێڕین و پڕشنگدار دەژمێردرێ، لەساڵی ۱۷۵۰ زایینی بووە بە فەرمانڕەوای ئەم میرنشینە لە قەڵاچوالان، بەپاشای (مقتول) لە

---

[12] بڕوانە : تأريخ سلێمانی و وڵاتی.

[13] الشيخ محمد خاڵ، الشيخ معروف النودهي البرزنجي، بغداد، ۱۹٦۱، جزو/۱، ص۱۲.

[14] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : محمد الفزلجي، التعريف بمساجد السليمانيه و مدارسها الدينييه، بغداد، ۱۹۳۸.

مێژوودا ناوبانگی دەرکردووە میر سلێمانی بۆ خۆی خوێندەوار و تێگەیشتوو بووە، رووناکبیران و زانایانی زۆر خۆشویستووە، هەرچی کتێبێك دەرچووبێ یان هێنرابێ بۆ ناوچەکە هەوڵی داوە بیخوێنێتەوە، ئەگەر تێنەگەیشتبێ هەوڵی فێربوونی داوە[15] لە (مقدمە تخمیس القصیدە البردیە) ل١٣دا هاتووە دەڵێ : کاتێك کە شێخ مارفی نۆدی دەچێتە لای ئەم پاشایە، چونکە یەکەم جار بووە پاشا نایناسێ لەپاشا پێی وت فلان کتێبت دەرکردووە خوێندمەوە بەلام زۆر شوێنم لێ ئیشکالە تێی ناگەم بەڵکو بۆم روون بکەیتەوە. جا کاتێك شێخ شەرحی شوێنە گرانەکانی بۆ دەکا، پاشا زۆر کەیف خۆش دەبێ و داوای لێ دەکا لە نۆدیەوە بچێتە قەلاچوالان و ببێتە دەرس بێژی خوێندنگاکانی ئەویش بەقسەی کردووە.[16] ئەم میرە مەزنە لە ساڵی ١٧٦٤ز بەدەستی فەقێ برایم کوژراوە و لە قەلاچوالان نێژراوە. لەدوای ئەم محەمەد پاشای برای کرا بە فەرماندار، دوای ئەویش ئەحمەد پاشای برای بۆ جاری دووەم، دیسان محەمەد پاشا هاتەوە سەر تەختو لە پاش چەند شەڕ و شۆڕێك لەنێوان میرانی باباندا، ئەحمەد پاشا بۆ جاری سێیەم فەرمانداری دەکا و لەدوای مردنی ئەحمەد پاشا مەحمود پاشا بوو بە فەرماندار، کەمەحمود پاشا ولاتی بەجێ هێشت، والی سلێمان پاشا پلەوپایەی میری میران دەدا بە برایم پاشای برازای و لە ساڵی ١٧٨٢- ١٧٨٣ز دەبێ بە فەرمانداری میرنشینی بابان[17].

## دروستکردنی شاری سلێمانی

دروستکردنی شاری سلێمانی گرنگترین رووداوی مێژوویی بوو لە سەردەمی ئیبراهیم پاشادا. ئەم پاشایە دەستی کرد بە بنیاد نانی شاری سلێمانی لەپەنا ئەو سەرایەی کە محمود پاشای مامی لە نزیك دێی مەڵکەندیەوە کاتی خۆی دروستی

---

[15] محمود ئەحمەد محەمەد، ((گەشتێك بەناو خوێندگاو شوێنەواری رۆشنبیری))، کاروان، ژ٦٧، ئابی ١٩٨٨، ل٢٧.

[16] سەرچاوەی پێشوو، پەراوێزەکان، ل٣١.

[17] ئەم زانیاریە مێژوویانەم زۆر بەکورتی لەم سەرچاوانە وەرگرتووە: تأریخ سلێمانی و ولاتی، آربعة قرون من تأریخ العراق الحدیث

کردبوو. لەساڵی ١٧٨٤ز. ئەم شارە تەواو بوو ناوی نا شاری سلێمانی و مەڵبەندی میرنشینەکەی لە قەڵاچوالانەوە گوێزایەوە ئەوێ. هۆی دروستکردنی ئەم شارە و ناونانی و گواستنەوەی مەڵبەندەکە، گەلێ مێژوو نووس و نووسەر لە بارەیەوە دوواون، ئێمە لێرەدا بەپێویستی نازانین دووبارەی بکەینەوە[18]، فراوانکردنی سنووری میرنشینەکە و ئاوەدانکردنەوەی شارێکی نوێ بە تایبەت بە مەبەستی مەڵبەند و پایتەخت دەبێتە هۆی پێشکەوتن و گەشەکردنی هەموو لایەکانی ژیان. دروست کردنی ئەم شارە کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەرووی پێشکەوتنی خوێندەواری و رۆشنبیریەوە بەپێی داب و نەریتی ئەو سەردەمە مەڵبەدنی خوێندەواری و فێربوون و رۆشنبیری مزگەوتەکان بووە. جگە لە مزگەوتی گەورە چەند مزگەوت و حوجرەیەکی دیکەش زیادی کرد. لەگەڵ گواستنەوەی میرشینەکەدا خوێنگاکەی قەڵاچوالانیش گوێزرایەوە بۆ مزگەوتی گەورەی سلێمانی، هەروەها کتێبخانە بەناوبانگەکەی کە گەلێ کتێب و نووسراوی بەنرخیان تیا بوو هەر لەوێدا چەند ژوورێکی بۆ تەرخان کرابوو یەکەم مامۆستا کە لەم فێرگەیە لە سلێمانی دەرسی وتەوە زانای بەناوبانگ شێخ مارفی نۆدێ بووە کە سەرپەرشتی کتێبخانەکەشی دەکرد و خەریکی نووسن و دانانی کتێبی ئاینی و ئەدەبی دەبوو، زۆربەیان بە زمانی عەرەبین و کەمێکیشی بە زمانی فارسی و تاقەدانەیەکیشی بە زمانی عەرەبی و کوردییە بەناوی ( ئەحمەدی)[19] بەکورتی برایم پاشا بە دروستکردنی ئەم شارە یادگارێکی باش و بەردەوامی بۆ کورد بەجێهێشت. مێژووی ئەم میرنشینە پڕە لە ئاڵوگۆڕ و هاتنە سەر تەخت و لابردنی میرو پاشا. برایم پاشا سێ جار و عەبدولرەحمان پاشا شەش جار دێنە سەر فەرمانڕەوایی و لادەبرێن تا لەکۆتاییدا مەحمود پاشا و چەند پاشایەکی تر تا دەگاتە عەبدوللا بەگ کە ئەمیش بۆ ماوەی چوار ساڵێك جێنشینی دەکا، تا لەلایەن نامیق پاشاوە بانگ دەکرێ بۆ بەغدا و دەینێری بۆ

[18] بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە : تأريخ سلێمانی و ولاتی، آربعة قرون من تأريخ العراق الحديث.

[19] الاحمدی فی ترجمە الكلمات العربيە بالكرديە، دراسە و تحقيق مجموعە من اوقاف السليمانييە، بغداد، ١٩٨٤، ل٢٤.

ئەستەمووڵ لە ساڵی ١٨٥١ز. ئەم میرنشینە لەناودەچێ[20] و دەکەوێتە ژێر فەرمانڕەوایی حکومەتی عوسمانییەوە.

## قوتابخانەی شیعریی ناوچەی سلێمانی

کورتەیەکی مێژوویی شیعری کلاسیکیی کوردی دەکەین بە دەروازەیەك بۆ چوونە ناو باسی پەیدا بوونی ئەم قوتابخانە شیعریە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا. بەگشتی ئەوانەی لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە نووسیویانە تێکڕا دیالێکتی کرمانجیی خواروو بەشە دیالێکتی لوڕی دادەنێن بە کۆنترین دیالێکتی زمانی کوردی کە شیعری پێ نوسرابێ و بابە تاهیری هەمەدانی ٩٣٥ – ١٠١٠ کۆنترین شاعیری کوردە کە شیعری بتەوی لەسەر ڕێبازێکی تایبەت بەخۆی نوسیوە[21] بە تاکە چوارینە دەناسرێتەوە و پێش بابەتاهیر لەم جۆرە شیعرە نابینرێ.

( شیعری بابە تایەر و بە کوردی نووسینی ئەو سەردەمە هەوڵ و کۆششی ئەو میر نشینانەیە کە پاش دەوڵەتی یەکگرتووی موسوڵمان پەیدابوون و هەوڵی ئەوەیان دەدا کە زمانە کۆنەکەی خۆیان بکەنەوە بە زمانی ئەدەبیات و زمانی ڕەسمی نووسین و کاروبار[22] لەپاش بابە تاهر بەچەند سەدەیەك هەندێ شاعیری کوردی بەناوبانگ لە ناوچەی سەرودا سەریان هەڵدا و دیالێکتی کرمانجیی سەروو، بەشە دیالێکتی بۆتانیان کرد بە زمانی شیعری خۆیان لەو شاعیرانەی بەم دیالێکتە شیعران نوسیوە : مەلای جزیری و عەلی هەریری و فەقێ ی تەیران، ئەمانە لە سەدەی پازدەم هاتوونەتە ناوەوە، ئینجا ئەحمەدی خانی لە سەدەی حەڤدەم بە مەم و زینەکەی لاپەڕەی مێژووی ئەدەبی کوردی ڕەنگین کردووە.

---

[20] تأريخ سليماني و ولاتى، ص٩١.

[21] بڕوانە : د. معروف خەزنەدار، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردی تازە، مۆسکۆ، ١٩٦٧٠ (بەزمانی ڕووسی). مامۆستای سەرپەرشتیار بۆی کردووم بە کوردی.

د.محمد نوری عارف، ((وشە و زاراوەکانی بابەتاهیر و بەراورد کردنیان لەگەڵ شێوەکانی زمانی کوردیدا)) گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، بەرگی ١٦-١٧، ساڵی ١٩٨٧.

[22] د. عیزەدین مستەفا رسول، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، بەغدا، ١٩٧١، ل١٩.

ئەو شاعیرانەی لەسەرەوە ناومان بردن هەر یەکە و پەروەردەی شار و ناوچەیەکی جیای وەك بۆتان و بایەزید و هەکاری و ئەشتایین، بەلام هەموویان زمانی شیعرەکانیان شێوەی بۆتانییە. خانی هەر بەو زمانە مەم و زینەکەی نوسیووە کە مەلای جزیری شیعری پێ وتووە.

لە شیعرەکانی مەلای جزیریدا هەستی نیشتمانی و خۆ بە کورد زانین و خۆشەویستی جزیرە و بۆتان و هەموو کوردستان تێکەڵاوی گیانی جزیری بووە ئەمە پاڵی بە دەروونی جزیریەوە ناوە کە دەڵێ : گوڵی باغی ئیرەمی کوردستانم

شەب چراغی شەبی کوردستانم

گەلێ شاعیری گەورە و بەناوبانگ لەمێژووی ئەدەبی کوردیدا هاتووە کە بە دیالێکتی گۆران، بەشە دیالێکتی هەورامی شیعریان نوسیووە. وەك بێسارانی ١٦٤١ – ١٧٠٦و خانای قوبادی ١٧٠٠ – ١٧٠٩، مەولەوی ١٨٠٦- ١٨٨٢.

خانای قوبادی لە شاکارە بەناوبانگەکەیدا شانازی کردووە بە کورد و زمانی کوردیەوە و دەڵێ (پێویستە لەم دنیای بەد رەفتارەدا (کە تا ئێستا رێی بەکارهێنانی زمانی خۆمانی لێ گرتووین) هەر کەس ئەو زمانەی خۆی بەکار بێنێ، ئەم رازی شیرینی شیرینو خوسرەوەش وەك چۆن نیزامی هۆنیویەتەوە، منیش بە کوردی بیهۆنمەوە و تا تێکرای خەڵکی کوردستان لێی بەهرە مەند بن[23].

جە عەرسەی دنیای دوونی بەد فەرجام

بـــە دەستوور نەزم (نیزامی) تەمـــام

بە لەفزی کوردی ، کوردستان تەمـــام

پێش بوان مەحزوز ، باقی (والسلام)[24]

جگە لەو شاعیرانەی خۆیان زادە و پەروەردەی شاخ و کوێستانی هەورامان بوون چەند شاعیرێکی تریش لە ناوچەی گەرمیان و شارەزوور بەم شێوەیە شیعریان نووسیوە.

بەلای ئێمەوە دەسەلاتی سیاسی و ئاینی گرنگترین هۆی پەرەسەندنی شێوەی گۆرانی (هەورامی) بووە وەك د.مارف خەزنەدار دەڵێ (( هۆی پەرەسەندن و

---

[23] شیرین و خوسرەو، شاکاری خانای قوبادی، ساغ کردنەوەی محمدی مەلا کریم بەغدا،١٩٧٥، ل ١٣-١٤.

[24] سەرچاوەی پێشوو، ل١٥.

پێشکەوتنی ئەم شێوەیە لەسایەی ئەم میرنشینە بەهێزەوە بوو کە بابا ئەردەڵان فەرمانڕەوایی دەکرد و ئەم شێوەیە زمانی رەسمی ئاین و مەزهەب و عەقیدە شاراوەکان بوو لە هەوراماندا))[25].

لە شاعیرە ناودارەکانی ئەم شێوەیە مەولەوی تاوگۆزی کە خۆی شێوە زمانی هەورامی نەبووە تەنیا لە شیعر نووسیندا هەورامی بەکاربردووە. ئەوەی سەرج راکێشە لە زمانی شیعری مەولەویدا، هەرچەندە شێوەی هەورامی بەکارهێناوە، بەلام وشە و زاراوەی ناوچەی سلێمانی و دەوروبەری زۆر تیا بەدی دەکرێ، لە هەندێ شیعریدا ئەوەندە لە شێوەی زمانی سلێمانی، دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست نزیك دەبێتەوە هیچ پێویست بە راڤە کردن و لێکدانەوەی وشەکانی ناکات و خەڵکی ناوچەکانی دەرەوەی هەورامانیش لێی حاڵی دەبن :

گوڵ چون روی ئازیز نەزاکەت پۆشـــان

وە فراوان چوون سەیل دیدەی من جۆشان

یان :

ئەم شەو دیارەن بانگم بێ شەرمەن

زایەڵەی سەمتوور کەللەم وەگەرمەن

زاراوەی گۆران رۆژێ لە رۆژان زمانی رەسمی میرنشینی ئەردەڵان و تا ماوەیەکیش هی بابان بووە، ئەوەی شایەنی باسە ماوەیەکی زۆرە ئەم شێوەیە دەوری خۆی وەك زمانێکی ئەدەبی لە دەست داوە. نووسەرە کوردەکانی ناوچەی هەورامان و زەنگەنە و کاکەیی کە بەم زاراوەیە قسە دەکەن بۆ نووسین زاراوەی سلێمانی — سۆرانی بەکار دەبەن[26] ئەستێرەی ئەم شێوەیە بەرەو کزبوون و نەمان رۆیشت، وە دوا شاعیری ئەم شێوەیە مەولەوی بوو ١٨٠٦ — ١٨٨٢ کە بە یەکێ لە شاعیرە گەورەکانی شیعری کلاسیکیی شێوەی گۆران دەژمێردرێ. لەوکاتەوە کە بزوتنەوەی شیعری تازە لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم دەستی پێکرد بە هاتنی نالی و هاوڕێکانی ئیتر وردە وردە بەکارهێنانی ئەم شێوەیە کەم بۆیەوە و زۆر بەکەمی شیعری پێ دەنوسرا.

---

[25] د. مارف خەزنەدار، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردیەوە، بەغدا، ١٩٨٤، ل٩٠.

[26] جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی ١٩٧٦، ل٢٢.

وەك لەوەو بەر باسمان کرد دروستکردنی شاری سلێمانی ڕووداوێکی گرنگ بوو لەسەردەمی میرنشینی ناوچەی سلێمانیدا کاریگەریەکی گەورەی کردە سەر باری خوێندەواری و ڕۆشنبیری، چونکە بەهۆی کردنەوەی چەند مزگەوتێکی ترەوە جگە لە مزگەوتی گەورە ژماری خوێندکاران و مامۆستا لە زیاد بوونا بوو، بەپێی داب و نەریتی ئەو سەردەمە فەقێ دەرسی تیادا دەخوێند و مەلای زانا و لێهاتوو دەرسیان تێدا دەوتەوە، لە حوجرەکاندا لە تەك ئەم دەرس خوێندنەشدا شیعرو ئەدەبیات بە زمانانی عەرەبی و تورکی و فارسی و کەم کەمێکیش بە کوردی لە ئارادا بوو.

میرنشینی ناوچەی سلێمانی (بابان) بەراستی وەکو سەربەخۆ وابوو تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم، لەو کاتەی کە ژیانی ئەدەب و خۆێندەواری کوردی لەناوچەی سلێمانیدا پەیدا بوو شێوەی کرمانجی ناوەڕاست وەك زمانی رەسمی هەلێکی باشی بۆ هەلکەوت کە بلاوبێتەوە و پەرە بسێنێ لەم سەردەمەدا لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا سێ شاعیری بەرز هاتنە کایەوە، نالی ١٨٠٠ — ١٨٥٦و سالم ١٨٠٥ — ١٨٦٩ و کوردی ١٨١٢ — ١٨٥٠ بوون ئەم سێ کەڵە شاعیرە دامەزرێنەری شیعری شێوەی کرمانجی ناوەڕاست بوون.پەروەردەی چاکترین شیعری موسلمانی بوون بەتایبەت شیعری غەزەلخوانە فارسەکان، ئەم شاعیرانە جوانترین وێنەی غەزەلو قەسیدەو قەسیدەی پالەوانییان بەزمانی کوردی هێنایە بەرهەم. بەرهەمی ئەم سێ شاعیرە بوو بە بنەما و سەرچاوەیەکی ڕووناك و پڕشنگدار کەلە ناوچەی سلێمانییەوە سەری هەلدا و تا ئێستا بەردەوامە و بەشێکی زۆری کوردستانی گرتۆتەوە. لە بەرهەمی ئەم سێ شاعیرەدا گەلێ نمونەی شیعری دەبینرێت کە بەسەر ئازایی و قارەکانی نەتەوەی کورددا گوتراوە و فرمێسك دڕێژن بۆ ڕووخاندنو لەناوچوونی میرنشینە کوردەکان، بەتایبەت نالی لە شیعری (تا فەلەك دەوری نەدا. . . . ) و سالم لە شیوەنەکەیدا بۆ بابانەکان و شیوەنی مەحمود ئاغای شیوەکەلێ. نالی لەو شیعرەیدا کە بەهۆی کۆچی دوایی سلێمان پاشای بابانەوەیە و پیرۆزبایی لە ئەحمەد پاشا دەکا، نالی گەورەیی و مەزنی ئەو دوو پاشایە دەردەخا و دەلێ :

تا فەلەك دەورەی نەدا سەد کەوکەبەی ئاوا نەبوو
کەوکەبەی میهری موبارەك تەلعەتی پەیدا نەبوو[27]

تا سلێمانان نەبوونە ســەدری تەختی ئاخیرەت
ئەحمەدی موختاری ئێمە شاهی تەخت ئازا نەبوو

نالی پەیوەندیەکی تایبەتی لەگەڵ سلێمان پاشای بابان و ئەحمەد پاشای کوڕیدا هەبووە. ئەم پەیوەندییەش، بەو بەڵگانەدا دەردەکەوێ کە لەو غەزەلانەی نالیدا دەبینرێن بۆ نمونە : ئەو غەزەلەی کە سەرەتاکەی بەم دێڕە دەست پێ دەکات :

بولبولی تەبعم ئەوا دیسان ســەنا خوانــی دەکا

کە تیادا دەڵێ :

هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین
خۆی کە دامێنگیری شـاهی ئـاسەفی سـانی دەکا

هەروەها :

ئـەم تــاقمە ممتازە کـەوا خـاسسەیی شاهن
ئـاشوبی دڵی مـەملەکەت و قـەلبی سـوپاهـن

جگە لە قەسیدە درێژەکەی کە بۆ سالمی هاوڕێی ناردووە و چەند قەسیدەیەکی تر ، بەڵام گرنگرتین بەڵگە ئەوەیە کە (( رۆژهەڵات ناس و کونسوڵی کورد لە پاریس خۆدزکۆ لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمدا لە ساڵی ١٨٥٣ چاوی بە ئەحمەد خان ناوێك کەوتووە، خەڵکی سلێمانی بووە و لە ئەستەمووڵەوە چووە بۆ ئەوروپا، خۆدزکۆ هەواڵی شاعیریەتی نالی لەو ئەحمەد خانە بیستووە و گویا دۆستیشی بووە))[28]

---

[27] دیوانی نالی،لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی،مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم،بەغدا،١٩٧٦، ل٢٦.
تێبینییەکی پێویست : هەرچی نمونە شیعریەکانی نالی هەیە لەم سەرچاوەیەی پێشوو دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، لێکۆڵینەوەو ساغ کردنەوە، د.مارف خەزنەدار، بەغدا، ١٩٧٧وەرگرتووە، لەکاتی خۆیدا لەبەر ئەوەی قەبارەی نامەی ماستەرەکە گەورە نەبێ ئەم تێبینییە بۆ ئەوشیعرانەیە کە سەرچاوەمان نەنوسیووە.

[28] دیوانی و نالی و فەرهەنگی نالی، لێکۆڵینەوەو ساغ کردنەوە، د. مارف خەزنەدار،بەغدا، ١٩٧٧،ل١٥.

شیعرەکانی نالی بەڵگەی گەلێ دیاردە و ڕاستی دەستکردی و وەستایی نالین و دەتوانین لە ڕێگای شیعرەکانییەوە، ئەو شێوازە تایبەتەی نالی پەیڕەوی کردووە بسەلمێنین کەوا نالی لەسەر ئەو باوەڕە بووە کە زمانی کوردی لەو پلەو پایەدایە کە شیعری بەرزی پێ بوترێ، دیارە هەر لەراستیشدا نالی زمان بە وەسیلە دادەنێ مانا و وێنە غایەتە لەشیعردا، ئیتر شیعری ئەو بەرزە چونکە مانای لە پلەی مانای شیعری شاعیرە هەرە بەرزەکانی شیعری موسوڵمانییە، با زمانەکەی تازە بێ، واتە تاقیکردنەوەی ئەم جۆرە شیعرەی زۆر نەبێ، نالی لە ئەنجامی ئەو بیرەوە بووە کە ڕێچکەی شکاندو هەر بەوەندە رازی نەبوو کە بە کوردی شیعر بڵێ بەڵکو خۆی خستە بەر تاقیکردنەوە و ئیمتیحانێکی گەورەشەوە. ئایا دەتوانێ بەزمانی کوردی قوتابخانەیەکی شیعری کوردی دروست بکات و خۆی بکاتە گەورە و ڕابەری ئەو قوتابخانە شیعریە؟

تەبعی شەککەر باری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا
ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی لەم عەمدا وا دەکا

یا لەمەیدانی فەساحەت بە میسلی شەهسوار
بێ تەئەمول بۆ هەموو نەوعە زمانێ ڕادەکا
کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردیە خۆ کردیە
هەرکەسێ نادات نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکا

ئەو هەوڵانەی پێش نالی و سالم و کوردی دراون، هەوڵێکی تاك و تەراو دوورە پەرێزن و ئەگەرچی بەشێکی گرنگی ئەدەبی کلاسیکیمان پێکدێنن، بەڵام ئەوان بۆخۆیان، قوتابخانەیەکی ئەدەبییان دروست نەکردووە. لەبەر ئەوە بۆمان هەیە بڵێن دروست بوونی کلاسیکیەت وەکو بزوتنەوەیەکی ئەدەبی خاوەن هەل و مەرجی بابەتی و خۆیی و وەك قوتابخانەیەکی خاوەن هەموو ڕێو شوێن و یاسا و دەستورێکی باو و زانراوی ئەدەبی کلاسیکی، لەسەردەمی بابانییەکاندا دروست بوو[29] بێگومان سەردەم و

---

[29] کەمال میراودەلی، سەرەتایەکی بۆ لێکۆڵینەوەی شیعری کلاسیکیی کوردی، دیداری شیعری کلاسیکیی کوردی، ئامادەکردنی حەمەسەعید حەمە کەریم، بغداد، ١٩٨٦، ل٧٧.

دەوروبەر بەبابەتی سەردەمی پەیدابوونی بیرو رای نوێ لەناو گەلانی هاوسێ و گەلانی دوورتردا دەورێکی گاریگەری هەبووە لەو سەردەمەی نالیدا و لەسەر ئەم قوتابخانە شیعریەی تیا هاتە کایەوە. هەرچەندە لە کوردستاندا بیرو هەستی نەتەوایەتی سەری هەڵنەدابوو، بەڵام بەپێی سەردەمەکەی کەوتبووە سەدەی نۆزدەم و دوای بەرپا بوونی شۆڕشی مەزنی فەرەنسە کە لەساڵی ١٧٨٩دا هەڵگیرسابوو (( ڕەنگدانەوەی بیرباوەڕی ئەوروپای سەرمایەداری لەوڵاتانی عوسمانلی و ڕۆژهەڵاتدا بەتایبەتی کە عوسمانلی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ئەوروپا دەوەستاو، لەهەمان کاتیدا کەوتبووە بەر تەکانی هێرشی ئابووری و ژیانی کۆمەڵایەتی پێشکەوتووی ئەوروپا، کارێکی ئەوتۆی کردبوو کە چەکەرەی نیشتمان پەروەری نوێ و هەستی نەتەوە پەرستی لەم وڵاتانەدا و لەناو ئەوانا لە کوردستانی عوسمانیشدا پەیدا ببێ))[30] نیشتمان پەروەری و هەستی نەتەوایەتی نالی لە زۆربەی شیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوەو بەجوانترین قەسیدە ئەو بیرەی خۆی بە زمانی کوردی داڕشتووە لەم مەیدانەدا وەنەبێ نالی تاکە سوار بووبێ و بەتەنیا کەوتبێتە تۆزکردن بەڵکو سالم و کوردیش سواری ئەسپی بەلاغەتی کوردی بوون و ئەملاو ئەولایان لە نالی گرت. سالم لە قەسیدە قارەمانییە بەناوبانگەکەیدا (لێم گەڕێن...) ئەگەرچی بۆ میرنشینی سلێمانی شیوەن دەکا، بەڵام سەرانسەری قەسیدەکە بۆ دیاریکردنی قارەمانییەتی و لاوچاکی و ئازایی کوردە سالم لە ئەدەبی کوریدا وەکو شاعیرێکی گەورەی غەزەل و داستانی وقارەمانی و قەسیدەی لاوچاکی ناسراوە :

لێم گـــــەڕین با گۆشەگیر بم دەستەو ئەژنۆ کەف زەنان
گێژەڵۆکـەی بای نەدامەت تاری کـرد سەفحەی جیهـــان
ســــاعقە و بەرقی نحووسەت زولّمەتی دا شەرق و غەرب
بـــــەردەبارانە بە مەخسوسی لەســــەر مولّکی بەبان
چـــــــاوی عیبرەت هەڵبڕە ئەی دڵ لە وەزعی دەهـری دوون
سەیری کە ڕۆمی دەڵەك چی کرد بە زومرەی کورد زمان

سالمیش وەك نالی بۆیدەرکەوت کە زمانی کوردی لە ڕازاندنەوەو دەربڕینی مانا و مەبەستی شیعردا سەرمایە و خەزێنەیەکی ورد و جیلوە بەخشە و ئەم جۆرە شێواز و

---

[30] محمد مەلا کریم، نالی لە کلاورۆژنەی شیعرەکانییەوە، بەغداد، ١٩٧٩، ل٥١.

دەربڕینانە تایبەتە بە مەڵبەند و ناوچەی شێخی گەورەوە، جا بۆیە سالم شیعری کوردی بە سەرمایە و دیاری زیرە دادەنێ و لە سلێمانییەوە دەیبا بۆ کرمان کەمەڵبەند و سەرچاوەی ئەم جۆرە دەربڕین و شێوازەیە. لێرەدا ویستویە ئەو قسەو پەیوەندەی ناو خەڵکی ناوەخنی دێڕە شیعرەکانی بکات کە دەڵێن زیرە بۆ کرمان دەبا.

زیرە سـەرمایەیە بۆ سالم و کـرمانی دەبـــــا
شیعری کوردی کە بدا جیلوە لەلای شێخی کەبیر

سالم هەر بەمەبەستی پەیڕەوی کردنی ڕێبازە ئەدەبییەکەی نالیەوە شانازی بە زمانی کوردیەوە کردووە و نەیویستووە، وەك لەوەو بەر باو بووە بە زمانی بێگانە شیعر بڵێ ئەگەرچی زۆر بەتواناو شارەزاو قەڵەم ڕەوی ئەم زمانانەش بووە بۆیە وەڵامی یارە خۆشەویستەکەی دەداتەوەو لەو دێڕە شیعرەدا مەبەستی ئەوەیە کە بە زمانی خۆی نەبێ وەڵام ناداتەوە و خۆی وا پیشان دەدات کە شارەزاو بەڵەدی ئیستلاحی ئەوان نییە.

وتم جەناب بەڵەد نیم ئیستیلاحی ئێوە، من کوردم

مستەفا بەگی کوردیش بە شیعرە پڕ هەست و سۆزە ناسکەکانییەوە هاوڕێیەتی نالی و سالمی کردو رابەرێتی ئەم قوتابخانە شیعریەی بە ئەرکی سەرشانی زانی و هەر بەزمانی پاراوی کوردی و شوێن کەوتنی نالی و سالم لە دەستور و ڕێبازی شیعریدا پارچە غەزەل و قەسیدەکانی داڕشت، مەبەستە شیعریەکانی لەگەڵ مەبەست و ناوەرۆکی شیعرەکانی نالی و سالمدایە، لەگەڵ ئەوەی بە گشتی شیعرەکانی غەزەلی دڵدارییە، بەڵام سۆزێکی قوڵی نیشتمانیشی تێدایە و دڵسۆزی و خۆشەویستی بەرامبەر بەگەل و نیشتمانەکەی بە زمانی شیرینی خۆی دەردەبڕێ، لە ماتەمنامە (وەسیەت نامە) بەناوبانگەکەیدا کە بۆ کۆچی دوایی خۆی وتووە دەڵێ :

عـــەزیزان مـن ئـەوا رۆییم لەلاتان
لـەمـەزڵومان بـەلا چـۆڵ بێ وڵاتتان
کە ئیوەن پادشای لوتـف و عەدالەت
بـــەخـوا حـەیفە بڕەنجێنن گەداتـان

ئەمن و جەفا فیراق و ئەمێدی و صـالّی یار
کاغەز رەفیقی رۆژمە شمعیش ئەنیسی شەو
(کوردی) دلێری عەرسەی نەزم و فـەستاحەتە
جـەولان دەکـا هەمیشە وەکوو بەرقی تیژڕەو

ئەو سێ شاعیرە نالی و سالم و کوردی بوون بە دامەزرێنەر و رابەری ئەم قوتابخانە ئەدەبییە تازەیە، هەر بەم بۆنەیەوە هەندێ لە مێژوو نووسانی ئەدەب و لێکۆڵەرەوان بە قوتابخانەی (نالی) یان قوتابخانەی (نالی و سالم و کوردی) و جارجارەش ئەم قوتابخانە ئەدەبییە تازەیە ناودەبەن بە قوتابخانەی بابان[31]. بەکارهێنانی زاراوەی (بابان) بەهەڵەیەکی رۆیشتووی گەورە دەژمێردرێت، بەلای ئێمەوە بەهیچ جۆرێك رەوا نییە کە ئەو ناوە کە ناوی بنەماڵەیەکی دیاریکراو بدرێتە پاڵ قوتابخانەیەکی ئەدەبی کە رابەران و پەیڕەوکەرانی بەهیچ جۆرێك پێوەندییان وەك خێزان بە بنەماڵەی بابانەکانەوە نییە، ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە بابانییەکان بەتایبەت میرەکانیان هیچ رۆڵ و دەورێکی گرنگی ئەوتۆیان نەبووەلە هاتنە کایە و دروست بوونی ئەو قوتابخانە ئەدەبییەدا. ئەم مەبەستەی سەرەوە لەم خاڵانەدا دەردەکەوێ :

١. هەرچەند میرە بابانییەکان، رووناکبیرو خوێندەوارو دڵسۆزی زانستو خوێندن بوون و گەلێ بەڵگە هەیە کە یاریدەو کۆمەکی خوێندەوارو مامۆستاو فەقێکانیان کردووە، بەڵام خۆیان زۆربەی نامەکانیان و نووسینەکانیان بە زمانی بێگانە بووە، واتە عەرەبیو تورکیو فارسی.

٢. تا ئێستا هیچ نوسراوو دیکۆمێنتێك دەرنەکەوتووە کە میرە بابانییەکان بە فەرمانێکی میری داوایان لە خەڵكو خوێندەوارو شاعیرەکان کردبێ کە بە زمانی کوردی شیعرو بەرهەمەکانیان بنوسن، واتە داهێنانەکە لەلایەن ئەوانەوە نەبووە، بەڵکو گەلێ بەڵگەی زانستی هەیە ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو سێ شاعیرە بەتایبەت نالی خۆیان خۆکردانە ئەو رێبازە نوێیەیان گرتۆتە بەر، ئەگەر ناوی قوتابخانەیەکی شیعری بەناوی

---

[31] لەوبارەیەوە بڕوانە: معروف خەزنەدار، مؤسس الادب الکردی الحدیث فی کردستان الجنوبیة نالی، ((شمس کردستان-رۆژی کوردستان))، العدد ٥و٦،ت١، ١٩٧١، بغداد.

کەسان و بنەماڵەیەکەوە ڕەوا بێت، ڕاستر وایە ئەو قوتابخانە شیعریە بەناوی نالیەوە بێت، یان نالیو هاوڕێکانی.

٣. جگە لە میرنشینی بابان چەند میرنشینی تر لە کوردستاندا هەریەکەو سەردەمێك فەرمانڕەواییان کردووە، بێگومان لەو سەردەمانەشدا شاعیرو نووسەریان هەبووە، بەڵام هەرگیز ناوی قوتابخانەی شیعریی بەناوی میرنشینەکانەوە نەبووە.

لەبەر ئەو ڕاستیانەی سەرەوەو وەك هەندێك لە مێژوونووسانی ئەدەب و نووسەران دەنوسن قوتابخانەی نالی یان نالی و هاوڕێکانی باشترینو ڕاسترین ناوێکە بۆ ئەو قوتابخانە شیعریە. خۆ ئەگەر بەناوی شوێنو ناوچەی ژیانی سەرهەڵدانی شاعیرەکانیشەوە بێت ئەوا بەلای ئێمەوە قوتابخانە شیعری ناوچەی سلێمانی بەباشتر دەزانین.

## زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو

هەوڵ و کۆششی نالی و هاوڕێکانی کە ڕابەرو دەستەی یەکەمی ئەم قوتابخانە ئەدەبیە بوون لە خاڵێکی سەرەکیدا دەردەکەوێ ئەویش گۆڕانی ئەو پەیڕەوە دووردرێژە بوو کە لە مێژووی ئەدەبدا پەیڕەو دەکرا کە بریتی بوو لە نووسین بە زمانی نەتەوەکانی دراوسێ. شیعرو دیوانی شیعر بە زمانی کوردی ڕێبازی خۆی گرت و دەستەی دووەم لە شاعیرانی دەوروبەری سلێمانی و ناوچەکانی تری کوردستان بە پیر ئەو بزوتنەوە ئەدەبیەوە هاتن.

دروست بوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو شێوازێکی تایبەتە و یەکێکە لە خاسیەتەکانی شیعری ئەم قوتابخانەیە. مەبەستمان لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو ئەو شێوە زمانەیە کە شاعیرانی دامەزرێنەری ئەم قوتابخانە ئەدەبیە کردیان بە زمانی شیعری خۆیان، ئەم شێوەیە بوو بەزمانی شیعری شاعیرانی دوای ئەمان و پێڕەویان کرد و تا ئێستا هەر بەردەوامە.

شێوه زمانی سلێمانی (قەڵاچوالان) واته ئەوانەی لەم قەڵاچوالانەوه هاتبوونه سلێمانی. بوو به بنەما و بنچینەی ئەم زمانه ئەدەبیه و به وشه و زاراوەی ناوچەکانی دەوروبەری سلێمانی، بەشه شێوەکانی دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست دەوڵەمەند کرا. ئەو شاعیرانەی له ناوچەکانی دەوروبەری سلێمانیدا سەریان هەڵدا. یان راستر بڵێین له بەشه دیالێکتەکانی تری دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست پەیدا بوون، زمانی ئەدەبی ئەم قوتابخانه نوێیەیان بەکار دەبرد. بەرهەمه شیعریەکانیان بوو بەهۆی بەردەوامی و چەسپاندنی شێوەی سلێمانی و بووه زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو.

ئێمه لێرەدا لەهەر ناوچەیەك که له رووی دابەش بوونی جوگرافیای زمانەوه سەر به دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاستن که پێکهاتووه له چوار بەش ( سلێمانی، سۆرانی، موکریانی، ئەردەڵانی) له هەر بەشه شاعیرێك وەك نمونه وەردەگرین بۆ دیاریکردنی ئەو مەبەسته واته (شێوازی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو).

وەك ئاشکرایه نالی مامۆستاو شاعیری گەورەی ئەم رێبازه ئەدەبیه پەروەردەی خاكو خۆڵی شارەزووره، بەڵام شێوەی زمانی شارەزووری نەکردووه به زمانی دەربڕینی شیعرەکانی، بەڵکو بۆ بەدیهێنانی ئامانجه سەرەکی و گرنگەکەی شێوەی سلێمانی کرد به زمانی شیعری خۆی.

هەر لەناو ئەوانەدا که رێچکەی نالیو سالمو کوردییان گرت واته دەستەی دووەم، دەبینین مەحوی ١٨٣٠ – ١٩٠٦ هەر ئەو زمانه ئەدەبیەی نالی بەکارهێناوه له شیعرەکانیدا و هەرچەنده خۆی به قەلەندەرێکی کورد دەزانیّ، بەڵام شانازی به دیوانه شیعریەکەیەوه کردووه و خۆی له ریزی پادشاو سەرکردەکاندا دادەنیّ :

بنـــووسه پیری دڵم ئەمری کرد ، ئیتاعەم کرد
لــــه ئیبتیداوه کـه بـەیتیّ موناسیبی دیوان
گەدایەکی وەکو (مەحوی)، قەلەندەرێکی کورد
میثالی پـــادشەهی فورسه، صاحێبی دیوان[32]

[32] دیوانی مەحوی، لێکدانەوه و لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالكريمی مدرس و محمدی مەلا کریم، بەغدا، ١٩٧٧، ص٣٤٨.

هەر لەناوچەی سلێمانیدا حەریق (١٨٦٥ – ١٩٠٩) یەکێکە لەو شاعیرانەی سەر بەم قوتابخانەیە دادەنرێ، ئەگەر چاوێك بەدیوانی حەریقدا بگێڕینو شیعرەکانی لەگەڵ شیعرەکانی نالیدا ریزبکەین، کاریگەری نالی و شێوازی نالی بە شیعرەکانییەوە دیارە تارادەیەك ئەگەر بڵێین حەریق یەکێکە لە قوتابیە زیرەکەکانی نالی بەهەڵەدا نەچووین، لەبەر ئەوەیە لە زمانی ئەدەبەکەی‌و تەنانەت لە وردەکاری و قوڵی واتاو بەکارهێنانی بابەتەکانی رەوانبێژیشدا پێڕەوی نالی کردووە و مامەڵەی لەگەڵ وشە و دارشتنی مانا ئارایی و بەکارهێنانی رەگەزدۆزیدا کردووە :

تاووسێ کە لەسەر زینتی باڵی سەری دانا
ئەمنیش بەپڕ فکرەوە بێ سەر و قەرارم

کەوتوومە ئەژێر دەستی شەیاتین و نەفسم
دەستێ بدەرە دەستی شکستەم بە عینایەت

بۆ چ هەر ئەمن مەخمووری بادەی مەستم؟
یا هەر من سەرمەستی جامی ئەلەستم
من لەبەر چاوی وتم بۆ مەزە چابوو لێوت
ئەو ئەڵێ جامی مەیە چا نییە بۆ تۆ نابی

لەوکاتەی کە نالی لە باسی عەشقی مەجازیدا دەڵێ :

عەشقێ کە مەجازی بێ خواهیش کەمە ئیلا کچ
شیرین کچ و لەیلا کچ، سەلما کچ و عەزرا کچ

دەبینین حەریق لە عەشقی حەقیقیەوە دەدوێ و وەڵامی نالی بەم شێوەیە دەداتەوە :

عیشقت کە حەقیقی بێ تالیب مەبە ئیلا کوڕ
هەم حەزرەتی لەولا کوڕ هەم یوسفی والا کوڕ

لێرەدا دەبینین نالی و حەریق زۆر بەراستی و لە جێی خۆیدا لە عەشق دەدوێن و عەشقی مەجازی و حەقیقی لێك جودا دەکەنەوە، هەرچی بۆچوون و بەکارهێنانی عەشق و دڵداری ئێستایە لە ئەدەبدا بە هەڵە بە عەشقی (حەقیقی) لەقەڵەم دەدرێ.

واتاکانیان بەپێشەوانەوە بەکاردەبرێن، بەڵام ئەوان بەراستی و هەریەکە بەپێی واتای خۆی بەجێی خۆیدا بەکاریان هێناوە.

سالم دەڵێ :

تــەلەب کاری حەقیقەت خاتری سالم لە باتن دا
ئەگــەرچی زاهیرەن دڵدادەیی عیشقی مەجازێکم

جگە لە ناوچەی سلێمانی شاعیرانی کەرکوك و گەرمیانیش زمانی ئەم قوتابخانە ئەدەبیەیان کردووە بە زمانی شیعرەکانیان و وردە وردە وازیان لە شێوەی گۆرانی (هەورامی) هێنا کە بەتایبەت لە ناوچەی گەرمیان و دەوروبەری کەرکوکدا باوو بوو. شێخ رەزای تاڵەبانی ١٨٣٥ — ١٩٠٩ هەر بەو شێوەیەی سلێمانی شیعرەکانی دارِشتووە، هەستی نەتەوایەتی و خۆشەویستی زمانی کوردی لەلای شێخ رەزا بەجۆرێ لە دڵو دەروونیدا چەسپیووە کە شیعر بەزمانی کوردی لە گەوهەر بەنرخ ترو پڕ حیکمەت تر دەزانێ و دەڵێ :

زوبــدەی مــەتاعی حیکمەتە ئەم شیـعری کوردیە
هـــــەرزانە بێ موبـــالەغە حەرفی بـە گەوهەرێ
جـــــامـەی حـەیاتی عـــاریەت کـورتـە زینهار
ئـــــــالوودە دامـەنی مـەکـە بــۆ پێچی مێزەرێ

******

دەمــکوژێ حــوکمە دەزانم بە خودا حوکمە حەبیب
وەرە سا بەشقی خودا دەس لە یەقەم بەردە تەبیب

*******

تـــالعم نـەحسە دەتـرسم کــە بە ئازاری فیراق
بمرم رۆژێ نـــــەبێ دەوڵـەتی وەسڵم بـەنسیب

لەناوچەی سۆران حاجی قادری کۆیی ١٨١٧ — ١٨٩٧ کەیفی و ئەختەر خۆیان کرد بە میرات گری نالی و سالم و کوردی و هەر بەو شێوەیەی ئەوان شیعریان نووسی و حاجی قادر دەیزانی شیعر بۆ کێ دەڵێ، لەبەر ئەوە بەشێوەیەك شیعری نووسیوە زۆربەی هەرە زۆری میللەتەکەی تێبگات، هەر ئەو پێش دەستیەی حاجی قادریش بوو رێی بۆ غەزەلی نیشتمانی و شیعری کۆمەلایەتی سیاسی خۆش کرد لە نیوەی یەکەمی

سەدەی بیستەمدا. وەك پێشتر وتمان حاجی ئەو مەبەستەی لا گرنگ بووە بۆیە پێڕەوی ئەو شێوە زمانەی کردووە لە داڕشتنی شیعرەکانیدا :

کـــە هەستا قامەتی بەرزی لە فەرقی تاوەکو ئەرزی
پـــەرێشان زولفی سـەد تەرزی بەیەکدا داڕژاو لەرزی

* * * * * * * * * * * * * *

لـەســـەر شەو رۆژی داناوە مەڵێن فێسی لەسەر ناوە
لـەبـەر بـا جامی یاقووتی بە مێشکی وشکی داداوە

لەناوچەی موکریاندا دوو شاعیری مەزن سەریان هەڵدا و بوونە پێڕەوی گەری رێبازە ئەدەبیەکەی ناوچەی سلێمانی ئەوانیش عەبدوڵڵا بەگی میسباحو دیوان و وەفایی بوون. ئەم دوو شاعیرە لەرووی زمانی شیعریانەوە هەر ئەو شێوازەی شاعیرانی ناوچەی سلێمانیان بەکار بردووە. لەلایەکی تریشەوە کاریگەری نالی و کوردی لە شیعرەکانیاندا بەتایبەت لەلای وەفایی بە ئاشکرا دەبینرێ. وەك محەمەد علی قەرەداغی دەڵێ : ئەوەی من بۆم دەرکەوتووە وەفایی بە شیعرەکانی مامۆستای شاعیرانی کورد (نالی) هۆگر بووەو گەلێ جار ماناکانی ئەوی هێناوە و خۆی بەرگێکی تازەی لەبەر کردوون[33]. ئەگەر بەوردی سەرنجی دیوانی وەفایی بدەین لە زۆر لای قەسیدە و غەزەلەکانیدا کاریگەری مستەفا بەگی کوردیش بەدی دەکرێ. ئەمانە چەند دێڕێکی وەفایین کە بەڵگەی ئەو راستیەن :

نـــەوبـــەهـار نـۆبـــەرەی شـکۆفـــە و گـولـێن
یـا غـــونـچـەی دوگـمـەکـــەی سـینـەکـەی وازن
بـــە نـەسـیم دەپـــشـکـوون بـا غـونـــچە سـێوان
بــە بـــا لـــە ئـــاهی مـــن دوگـمـــە دەتـــرازان[34]

نەداغی جـــــەرگی خـۆم زانی، نە مایەی بەرگی خوێنینم
شـاهیدی دەستی عیشقم، لالە رەنـــگم، مـــن کەڕو لاڵم

---

[33] دیوانی وەفایی، میرزا عبدڕەحیمی سابلاخی، لێکۆڵینەوەی محمد عەلی قەرەداغی،بەغدا، ١٩٨٦،ل٣٥.
[34] دیوانی وەفایی، ل٨٨.

بۆخۆت سەرمەشقی.زوڵف و دەرسی باڵات دام و ئەز چ بکەم؟

نیشانە و دەس خەتی خۆتە ئەگـــــەر ئەلفم ئەگەر داڵم

***********

ئـــەمن ئوفتادە بوم تـــۆ خۆت بە روحمت دەست گیرم

بوی پەشیمانی نەشێوەی تۆیە، ئـــەی خورشیدی ئیقباڵم[35]

****************

ئـــــەلئەمـان ســەرتـا قــەدەم سوتام و جانانم نەهات

چـاو لـە سورمـــەی خاکی رێ بووم راحەتی جانم نەهات

خـــــاڵ و خەت گوڵزار و رەنگی شۆخـــی بێ باکم نەدی

زوڵف و روو هیند و فەرەنگی شــاهـــی خووبانم نەهات

ئـــەی عەجەب گریـــام وەکو هـــــەوری بەهاران و کەچی

پێکەنینی ئـــــەو گولـــەی کـاکۆڵ پەرێشانم نەهـــــات[36]

هەر بەو شێوەیە لەلای ئەدەب زمانی شیعری ئەمیش بەردەوامی ئەو زمانە ئەدەبیە یەکگرتووەیە چ لەرووی شێوە زمان و وشە و زاراوەوە، چ لە رووی پێڕەوی رێبازی شیعری ئەم بزوتنەوە ئەدەبیەشەوە، خاسیەت و شێوازە تایبەتیەکانی قوتابخانەی شیعری ناوچەی سلێمانی پێوە دیارە :

بە کەمەندی زوڵفی خـاوت، دڵی ئێمە کـەوتە داوت

عـــەجەبا کــــە شەهسوارم بە شکاری مەی نەزانی؟

ئـــەدەبا بە شەرتی جاران، ئەمنم کە جـــان سوپاران

کــــە نـــەڵێ رەقیبی نادان بە وەفا نەبوو فلانی؟[37]

بـــــــۆ بـەشی مـــە خواری یە لەو قامەتی شیرینی تۆ

خار و خورما پێکەوە دەگـرێ _ ئەگەر نەخلی _ روتەب

---

[35] دیوانی وەفایی، ل ٦١.

[36] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

[37] دیوانی ئەدەب، یادگاری عبداللە بەگی مصباح دیوان، چاپی سێیەم، هەولێر، ١٩٦٦زا، ل١٠٩.

یـــا ڕەب دەبێ هەر ئەمن و ئەتۆ بین بەبێ ڕەقیب

بــــــگرم لــــــە گەردەنی بخەم، ئەو زوڵفی تابەتات

✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻✻

گەر موخەییەر بێ لە هەر دوو عالەم و خـەندێکی تۆ

خەندەیێك لەو دلبەرە نادا بە دوو عـالەم (ئەدەب)[38]

بەشی چوارەم و دوا بەشی دیالێکتی کرمانجیی خواروو ئـەو بەشـەیە کە دەکەوێتە سنووری هـەرێمی ئەردەڵانـەوە کـە تـا سـەردەمی پەیـدا بـوونی قوتابخانەی شـیعری کلاسـیکیی نـوێ شـاعیرانی ئـەو ناوچـەیە بـە دیـالێکتی گۆرانی (شێوەی هـەورامی) شـیعریان دەنووسـی، بـەڵام زمـانی ئـەدەبی ئـەم قوتابخانە تازەیە بەرەو ئەو ناوچـەیەش هـەنگاوی نـاو شـاعیرانی ئـەردەڵانیش بەپیر ئەو بزوتنەوە ئەدەبیەوە هاتن و شێوەی سلێمانیان کرد بە زمانی شیعری خۆیان. لەو شاعیرانە سالمی سنە و مەجدی، بەرهەمی شیعری ئەمانە نمونـەی شیعری بەرزی ئەو ناوچەیە بوو. لەشیعرەکانی مەجدیدا شیوازە تایبەتیەکـەی ئەم قوتابخانە تازەیـە بـەدی دەکـرێ و ئـەوانیش بـەزمانی ئـەدەبی شـاعیرانی ناوچـەی سـلێمانی ئاشـنا بـوون و کردیانـە زمـانی شـیعرەکانی خۆیـان. بـەو شێوەیە سالمی سنە و مەجدی و چەندانی تریش بوون بە ئەستێرەی پرشنگداری ئەم قوتابخانـە ئەدەبیـە لەناوچـەی ئەردەڵانـدا، مەجـدی بـەم شـێوەیە وەسـفی یارەکەی دەکا و دەڵێ :

لەدووڵا زوڵفی لاو لاوە لەسەر ڕووی قامەت ئاڵاوە

خەم و پێچی هەموو داوە، چ لەم لاوە، چ لەو لاوە

موژەی وەك نێشی پەیکانە، هەمیشە کاری پێکانە

دڵی هەر خوێش و بێگانەی بە ئەم پەیکانە پێکاوە[39]

---

[38] عبدالله بەگی مصباح — دیوان، شاعیری گەورەی خاکی موکریان، لێکۆڵینەوەو بڵاوکردنەوە، نووسینی دکتۆر مارف خەزنەدار، بەغدا، ١٩٧٠، ل ٢٥،٢٦،٢٧.

له سنەوه بەرەو کرماشان بڕۆین دەبینین کە دامێنی چیای دالەهۆ لە دەشتە پان و بەرینەکەی مایدەشتدا، شاعیری بەدیمەنی ئەم ناوچەیەش سەید یەعقووبی مایدەشتی ١٨٠٨ — ١٩٠٦ کە ٩٨ ساڵ ژیاوە یەکێکە لە شاعیرانی شێوەی کەڵهوڕی دیالێکتی لوڕی و بەشێوەی خۆی و شێوەی گۆرانی (هەورامی) شیعری نوسیووە، کاریگەری زمان و ئەدەبی نالی و ئەم قوتابخانە نوێیە لە هەندێ لەپارچە شیعرەکانیدا رەنگی داوەتەوە، چ لە رووی شێوازی بەکارهێنانی شێوە زمانەکەیەوەو چ لە رووی شێوەو فۆڕمی شیعرەکەیەوە زۆر کاریگەرە بە نالیەوە :

قودرەتی حق بێن تەماشاکەن کە لەو یەك قەترە ئاو

نــار و نــارنجی یو لیمۆ لەو شەکەرنەی کردووە[40]

کاریگەرە بەو غەزەلەی نالی کە بەم دێڕە دەست پێ دەکا :

گـوڵبونی قـەدت لە قوبەی سینە غونچەی کردووە

غـــونچە بەم شیرینییە قەت نەیشەکەر نەی کردووە

دیسان سەید یەعقووب دەڵێ :

روخساری تۆ وەك مانگ و دوو زوڵفت وەکو عەقرەو

هـەرچـەنـد کە قەمەر عەقرەوە رازیم بە قەزاوە[41]

ئەم شیعرە کاریگەرە بەو غەزەلەی نالی کە بەم دێڕە دەست پێ دەکا :

زوڵفت بــە قـەدت دا کـە پـــەرێشان و بـڵاوە

ئـــەمـــڕۆ لـــە منی شـیفتە ئـــاڵۆز و بەداوە

له ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەتوانین بڵێین زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو شێوازێکی سەرەکی و دیارە لەم قوتابخانە شیعریەدا و ئەگەر چاوێك بگێڕین بە زۆربەی غەزەل و قەسیدەکانی ئەو شاعیرانەی لەم بەشەدا باسمان کردن و هەروەها ئەو شاعیرانەی تریش

---

[39] علاءالدین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٧٠، ل٤١٨.

[40] دیوانی سید یعقوب ماهیدەشتی، بسعی و اهتمام، محمد علی سلطانی، ١٣٦٢ه، ص٢٤.

[41] سەرچاوەی پێشوو، ص٢٥.

کە سەر بەم ڕێبازە ئەدەبیەن، بەگشتی لە بەرهەمی شیعری هەموویاندا ئەم شێوازە بەدی دەکرێ ئەم یەکێتی شێوازەش لە زماندا لە ئاستە جیاوازەکانی زماندا دەردەکەوێ، وەك لە ئاستی فۆنێتیك (دەنگسازی) و مۆروفۆلۆژیەو (وشەسازی)دا دەردەکەوێ. وەك تۆفیق وەهبی لە باسی پەیدابوونی شێوەی سلێمانیدا دەڵێ : زۆری پێ نەچوو شێوەی ئەردەڵانی شارەزوور بەرە بەرە دەستی کرد بە تێکەڵاو بوون لەگەڵ شێوەی قەڵاچوالانی باباندا لە سلێمانی بەڵام دەبێ بزانین کە ئەم تێکەڵاویە هەر لە مەیدانی فۆنێتیك و مۆرفۆلوژی، وە وشە وەرگرتندا رووی دا[42]. هەرچی لە رووی (رستە سازیەوە) سینتاکسە ئەمە شێوازێکە لەلای هەموو شاعیرەکان وەك یەك نییە و شێوازی سالم لەم قوتابخانەیەدا بە ئاشکرا لەوانی تر جیا دەکرێتەوە لە بەشی سێیەمی ئەم نامەیەدا باسی لێوە دەکرێ.

ئەو یەکێتی شێوازەی لە زمانی شیعری ئەم قوتابخانەیەدا دەبینرێ لە رووی فونێتیکەوە (دەنگسازیەوە) لەم خاڵانەدا دەردەکەوێ :

١. بەکار هێنانی نیشانەی کاری رانەبردوو (دە) لەبری (ئە)، لەم رووەوە تۆفیق وەهبی گەلێ بەڵگەی هێناوەتەوە بۆ راستی و چەسپاندنی بەکارهێنانی ئەم نیشانەیە کە بە پیتە قاڵبی ناودەبا، لەو بەڵگانە لەرووی مێژووییەوە دەڵێ (( سێ بووژێنەرەوەکانی زمانی ئەدەبی سلێمانی نالی و سالم و کوردی کە لە یەکەم چواریەکی سەدەی نۆزدەدا لە حوجرەکانی سلێمانیدا خوێندویانە پیتی (دە)یانە بەکارهێناوە لە شیعرەکانیاندا نەك (ئە)، لەگەڵ ئەوەشدا کە نالی یان جافێك بوو خەڵکی دێی خاك و خۆڵ لە دەشتە نەویەکەی شارەزوور[43]. لەراستیدا بەلای ئێمەوە ئەگەر بەوردی سەیری ئەم نیشانەیە بکەین لە هەر دوو شێوازەکەدا دەنگێك هاوبەشە و یەك دەنگی سەرەتاکەی دەگۆڕێ و جیاوازە کە بریتیە لە (د) و جێی (ئـ)دەگرێتەوە، کەواتە دەنگی

---

[42] تۆفیق وەهبی، ئەسڵی پیتەقاڵبی (ئە)ی شێوەی سلێمانی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم،١٩٧٣، ل١٣-١٤.

[43] تۆفیق وەهبی، ئەسڵی پیتەقاڵبی (ئە)ی شێوەی سلێمانی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم،١٩٧٣، ل ٢٣.

یەکەمی هەردوو شێوەکە جیاوازە و بەگوێرەی یاسای دەنگی زمانی کوردی دەگۆڕێن و بزوێنی (ــە) لە هەردوولا هاوبەشە.

نمونەی شیعری گەلێ زۆرە کە ئەم بەکارهێنانەی (دە)ی تیا بێ :

پێم دەڵێن مەحبووبەم خێل و قیچە مەیلی شەڕ دەکا
خێل و قیچە؟ یا تەرازووی نـازی نەختێ سەر دەکا

* * * * * * * * * * * * *

دەزانــم دێتــە ســەر چـی کـــاری ((سالم))
فــریـبـی چــاوی تــۆ دەیــکا بە بەلعەم

* * * * * * * * * * * * *

عەبەس کوردی مەلائیك دێن دەپرسن مەزهەب و دینت
کە قادر خۆی دەزانێ من لەسەر کام مـەزهەب و دینم

٢. بەکار نەهێنانی هەندێ دیاردەی فونێتیکی ناوچەیی وەك ئاڵوگۆڕ کردنی دەنگەکان، بۆ نمونە دەنگی (ڵ) و (ڕ) لەناوچەی سۆران، بەتایبەت لە کۆیە و دەشتی هەولێر، دەنگی (ڵ) دەبێ بە (ڕ). هەروەها (و) دەبێ بە (ی). لەناوچەی شارەزووریش لەزۆر وشەدا دەنگی (ب) دەبێ بە (و) وەك (بییە) دەبێ بە (بیوە) ئەبەم = ئەوەم، گەلێ نمونە لەم رووەوە لە شیعرەکانی نالیدا دەبینرێ. نالی خەڵکی شارەزوور بووە بەڵام پەیڕەوی یاسا دەنگیەکانی ناوچەی شارەزووریشی نەکردووە، هەروەها سالم و کوردیش بە زمانی ناوچەیی و شێوە زمانی خۆیان کە دانیشتووی سلێمانی بوون شیعرەکانیان نەنوسیووە، ئەم دیاردانە لە شیعری شاعیرانی دەستەی دووەمدا واتە دوای نالی و سالم و کوردی بەباشی دەردەکەوێ.

حاجی قادری کۆیی دەڵێ :

لەسەر شەو رۆژی (داناوە) (مــەڵێن) فێسی لەسەر (ناوە)
لەبـــەر بـــا جامی یاقووتی بە میشکی وشکی (داداوە)

حاجی قادر بەلای زمانی ئاخاوتنی کۆیەوە نەچووە، ئەگەر وای کردبایە دەبوایە بیگوتبایە :

لـەســـەر شەو ڕۆژی (دانایە) (مەرێن) فێسی لەسەر(نایە)
لەبەر بـــا جامی یاقووتی بە میشکی وشکی (دادایە)[44]

بەهۆی زۆری و بڵاوی لقەکانی مۆرفولۆژی (وشەسازی)یەوە ناتوانرێ هەر بەشە و لە بەشەکانی ئاخاوتن سەربەخۆ و بەجیا لەڕووی شێوازی زمانەوە دیاری بکرێ، بەڵام ئێمە لێرەدا چەند نمونەیەکی زۆر دیارو ئاشکرا دەخەینە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەی شێوزا گەریانە. هەر ئەم دیاردەی فراوانی و فرە لقی بەشەکانی ئاخاوتن و لەلایەکی تریشەوە نەشارەزایی و بێ ئاگایی ڕەخنەگران و لێکۆڵەرەوان لەدیاریکردنی شێوازی تایبەت بەم قوتابخانەیە و جیانەکردنەوەی لق و بەشەکانی زانستی زمان و زمانەوانی بۆتە هۆی ئەوەی هەندێ لەو نووسەرانە لەم ڕووەوە زۆربەی بەشەکانی ئاخاوتن تەنیا بە (وشە) لەقەڵەم بدەن و تێکەڵ بەیەکتریان بکەن[45] ، هەروەها تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لەم بارەیەوە بە ئەنجام نەگەیشتووە، بەڵکو ئەوانەی تا ئێستا لەم ڕووەوە نووسیویانە بەهیچ جۆرێ لەڕوانگەی شێواز و شێوازگەریەوە لەشیعرو بەرهەمی ئەو شاعیرانە نەکۆڵیونەتەوە. باسەکانیان تەنیا تەرخان کردووە بۆ باسێکی کەم و کورت لەبارەی لایەنێکی بچوکی زمانەوە، یا بەگشتی و بێ دیاریکردنی سنوری باسەکە، زۆربەی زۆری ئەو نووسینانە لەچوارچێوەی هەندێ لێکۆڵینەوەی سادە دەربارەی نالی و زمانی نالی و هەندێ دیاردەی زمانەوانی لای نالی زیاتر ناچنە دەرەوە وەك لەوەوبەر وتمان ئێمە لێرەدا وەك نمونە لەچەند لایەنێکی (بەشێکی مۆرفۆلۆجی) دەدوێین کە بە زۆری و ئاشکرا شێوازی تایبەتی ئەم قوتابخانەیە دیاری دەکەن.

ڕاناو (جێناو) بەشێکی دیارو گرنگە و بەکارهێنانی جێناوەکانی زمانی کوردی لەلای زۆربەی زۆری شاعیرانی ئەم قوتابخانەیە بەگشتی شێوازێکی یەکگرتووی هەیە، کۆمەڵێ ڕاناوی تایبەت و دیاریکراو کە بریتین لە (ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك ئەمن و ئەز لەگەڵ کەسی دووەمی تاك ئەتۆ)، ئەم ڕاناوانە بەگشتی لەلای هەموو شاعیرانی سەر بەم ڕێبازە ئەدەبیە چوون یەکە، واتە شاعیران وەکو یەك بەکاریان هێناوە،

---

[44] کریم شارەزا، نالی و زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، بەغدا، ١٩٨٤، ل٥٢،٥١.

[45] بۆ نمونە بڕوانە ئەم نووسین و لێکۆڵینەوانە: کەریم شارەزا، سەرچاوەی پێشوو، د.ئەمین عەلی مەتابچی، زمانی نالی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کوردی، بەرگی ١٣، ١٩٨٥.

تەنانەت لای ئەو شاعیرانەی کە لەشێوە زمانەکەشیاندا ئەو راناوانە بەو شێوەیە بەکارنابەن. د.ئەمین عەلی موتابچی هۆی بەکارهێنانی ئەم راناوانە لای نالی دادەنێ بەتێکەڵاوی و ئاشنایی نالی لەگەڵ شێوە زمان و ناوچەکاندا، بەهۆی گەران و گەشتی زۆری نالیەوە دەڵێ (خۆ ئەگەر بهاتایە نالی بەهۆی دەرس و مەلایەتیەوە بەرەو بادینان ژوورو بڕۆشتایە دوور نییە کە زۆر وشە و زاراوەی کرمانجی ژووروی تێکەڵ زمانی شیعرەکانی ببوایە)[46]، بەڵێ راستە گەران کاریگەری هەیە لەسەر زمان، بەڵام نالی گەلێ وشەو زاراوەی شێوەکانی تری زانیوە و بە مەبەست و دەسئەنقەست ئەو راناوانەی بەکارهێناوە بەهیوای دروست کردنی زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو ئەم کارەی کردووە، لەلایەکی تریشەوە دەبێ بۆ ئەوەش بچین کە ئەشێ نالی بەمەبەستی زیندووکردنەوەو هەوڵ دان بۆ نەفەوتانی هەندێ راناو، وەکو (ئەز)، چونکە گومان لەوەدا نییە کە لەو سەردەمەدا و لەوەو پێشتر ئەم راناوە لەناوچەی سلێمانیشدا بەکارهاتووە[47] وردە وردە بەرەو کزی و نەمان رۆیشتووە.

ئەمە و هەرچی راناوی (ئەمن و ئەتۆ)یە وەك پێشتر وتمان سالم و کوردی و شاعیرانی پاش ئەمانیش لە زمانی شیعریاندا جار جارە بەکارهێنانی ئەم راناوانەیان کردووە بە شێوازێکی زمانی خۆیان. لێرەدا چەند نونەیەك دەخەینە پێش چاو :

تـۆ قـاز و ئەمن شاهێن مەقرێنە بەدەورمدا
نەك حەملە بەرم گیرکەم چنگێ لە چیقڵدانت[48]

* * * * * * * * * * *

خـــاو و بێ خاوی دوو زوڵفی خاوم ئەز
چـــــاوە چاوی یەك غەزالە چاوم ئەز[49]

---

[46] د.ئەمین عەلی موتابچی، زمانی نالی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، بەرگی١٣ ،١٦٨٥، ل٧٥، ٧٦.

[47] ئەسڵی پیتە قاڵبی(ئە) گۆڤاری کۆڕی زانیاری، بەرگی(١)، بەشی(١)، ل ١٣-١٤.

[48] دیوانی سالم، کوردی و مەریوانی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٣٣، ل٢٢.

[49] دیوانی و نالی و فەرهەنگی نالی، دکتۆر مارف خەزنەدار، بەغدا، ١٩٧٧، ل٦٣.

ئـــــەمن فەرهاد و شاهد (بێستوون)ە
ئەتۆ شیرین شەماڵ شاپوورە ئەمشەو[50]

* * * * * * * * * * * * * * *

گـــا دەسوتێم گا دەگرییێم غەرقی ئاو و ئاورم
ئاخ لەبەر بەختی سیا : نازانم ئەز بۆچ نامرم؟[51]

* * * * * * * * * * * * * * * * * * *

لــــەبەر تاوی جەمالی عالەم مومکین بۆ ئارامم
دەسوتام ئەز ئەگەر سایەی سەری زوڵفی نەبویایی[52]

لەرووی بەکارهێنانی بەشەکانی تری ئاخاوتنەوە، وەك ناو، کردار، چاوگ، ئاوەڵناو. . . هتد، شێوازێك بەدی دەکرێ لەلای زۆربەی زۆریان ئەویش ئەوەیە لە رووی گەردان کردن و بەکارهێنانی ئەو بەشانەی ئاخاوتندا لە رستە و شیعرەکانیاندا، خۆیان نەبەستۆتەوە بەشێوەو رێزمانی ناوچەیی خۆیانەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، نالی رووەدەکاتە موکریان و سۆران و بەرەو ناوچەکانی کرمانجیی سەرووش مل دەنێ بۆ چنگ خستنی وشە و زاراوە، تا شیعرەکانی پێ بڕازێنێتەوە، و ئەم کارەش کارێکی هەڕەمەیی نەبووە، بەڵکو بە مەبەست و ئامانجی زمانێکی ئەدەبی فراوانی یەکگرتوو بووە. هەروەها سالم و کوردی ئەمانیش چەندین وشەی شارەزوور و ناوچەکانی دیکەیان ناواخنی شیعرەکانیان کردووە وەك (ئەر)ی شارەزوور لەبری (ئەگەر) و (بلا)ی کرمانجیی سەروو. گەلێکی تر.

شیخ رەزاش و شاعیرانی دەستەی دووەم و دواتریش، گەلێ وشەی ناوچەی سلێمانی و ناوچەکانی تریان بەکارهێناوە، بێگومان ئەگەر بەوردی سەرنجی شیعرەکانی شاعیرانی موکریان و ئەردەڵانیش بدەین کۆمەڵێکی زۆر لە وشە و زاراوەی ناوچەی سلێمانی و شارەزوور و سۆران دەبینین. لێرەدا بایەخی فەرهەنگی ئەدەبی و نرخ و سودی فەرهەنگی شاعیرانمان بۆ

---

[50] دیوانی کوردی، کوردی و مەریوانی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٣١، ل٢١.

[51] دیوانی وەفایی، لێکۆڵینەوەی محمد عەلی قەرەداغی، ل٥٩.

[52] دیوانی وەفایی، لێکۆڵینەوەی محمد عەلی قەرەداغی، ل١٦٧.

دەردەكەوێ وەك فەرهەنگەكەی نالی (دەتوانین ئەم فەرهەنگە بە كلیلی قفڵی شیعری كلاسیكیی كوردی دابنێین لە كوردستانی خواروودا كە نالی دامەزرێنەریەتی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە تا ماوەی نێوان هەردوو جەنگ، چونكە ئەو كۆمەڵە وشە و تەعبیرانەی كە نالی بەكاریهێناون زۆربەی هەرە زۆریان بەردی بناغە و بنچینەی زمانی شیعری ئەدەبی كوردستانی خواروو بوون[53].

لەئەنجامی ئەم لێكۆڵینەوەو دیاریكردنی ئەو شێوازەی كە باسمان كرد و سەلمێنەر بوون بۆ پێناسە و شیكردنەوەی واتاو چەمكی شێواز كە بریتی بوو لە كۆمەڵێ سیفات و تایبەتی وەك فەرهەنگی شاعیر یا نووسەر، داڕشتنی زمان بەكارهێنانی ئەو بەشانەی ئاخاوتن . . . هتد[54] ئەم خەسڵەتانە شێوازێكن سنوری ڕێبازی ئەدەبی دەكێشن لە قۆناغێكی دیاریكراودا و لەرووی زمان و بەكارهێنانی كۆمەڵێ وشە و زاراوەوە كە تایبەتە بەو قۆناغ و ڕۆژگارەوە، شاعیرانی سەر بەو قوتابخانە ئەدەبیە بەو شێوازە لە شاعیرانی دەرەوەی خۆیان جیا دەكرێنەوە.

---

[53] دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، ل٢٥.

[54] Coles Editorial Board, Dictionary of Literary Terms, P.194.

# کاریگەری زمان و ئەدەبیاتی نەتەوە موسوڵمانە دراوسێکان

ژیانی ئەو شاعیرانەی سەر بە قوتابخانەی شیعری کلاسیکی کوردی بوون بەتایبەت نالی و سالم و کوردی، کەوتبووە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم. ناوچەی سلێمانی بەتایبەت و کوردستان بەگشتی لەو سەردەمەدا لەرووی دەسەڵاتی سیاسیەوە، یا سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بووە یا جارجار لەژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوا ئێرانییەکاندا بووە، ئەم دوو دەوڵەتە گەورەیەش لەرووی ئاینییەوە سەر بە ئاینی ئیسلام بوون. ئەمە بوو بووە هۆی ئەوەی کە زمانی رەسمی لە کوردستانا بە زمانی ئەوان بێت، زمانی عەرەبیش زمانی ئاینی ئیسلام بووە و کوردستانیش بەگشتی یەکێك بووە لە وڵاتە ئیسلامیەکان، ئەمەش هۆیەکی سەرەکی بووە بۆ ئەوەی زمانی زانست و ئەدەب و رۆشنبیری گەلی کورد یا بەعەربی یا بە زمانی دراوسێکانی بێت، وەك ئاشکراشە شاعیرانی ئەو سەردەمە یا مەلایەکی بەتوانا و زیرەك بوون یا خوێندەوارێکی ئاینی و پەروەردەی مزگەوتەکان بوون. لەبەر ئەمە رۆشنبیری و خوێندن و زانستیان بریتی بووە لەو بەرهەمانەی کە بەو زمانانە بوون، بەڵگە نەویستە کە ئەو زمان و ئەدەبەش کاری کردۆتە سەر خوێندەوار و شاعیرانی کورد چ لەرووی زمانەوە بێت یا بیرو ناوەرۆك. کاریگەری ئەدەبیاتی نەتەوەکان لەسەر یەکتری کارێکی سروشتی و ئاساییە، هەر لە مێژە گەلێ نمونەی ئەدەبیاتی نەتەوەکانی تر یا نووسەرانی سەردەمە کۆنەکان بە بەرهەمی شاعیر و نووسەری قۆناغەکانی پاش ئەوانەوە دەبینرێ ( ئەبو عەلای مەعەڕی و ئەبوو حەفسی خیام نابێ ئێمە وا بزانین ئەو فیکرانە کە ئەوان دەریان بڕیوە هەمووی هی خۆیان بووە، گەلێ لە فیکرەکانیان هی پێشوو بووە. هەروەها لە ئەدەبی فارسیشدا لە مەولانای رۆمی و حافزی شیرازیەوە بیرە راشتە فیکرەی فەلسەفی و دەروێشیان هەبووە، بەڵام ئەوانیش لە باوەڕ و ئەفکاری پێش خۆیانیان وەرگرتووە)[55] ئەم دیاردە سروشتیە بەم شێوەیە گەیشتۆتە ئەدەبی کوردیش و شاعیرانمان لەو شاعیر و نووسەرە فارسانەوە گەلێ کەڵکیان وەرگرتووە، بەڵام ئەم وەرگرتنە وەنەبێ لە پلە و

---

[55] عەلائەدین سجادی، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، بەغدا، ١٩٧٨، ل٨٧.

پایەیی شاعیران و نووسەرانی کەم کردبێتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، چونکە ئەم کارەیان بە زرنگی و زیرەکی و هۆشیاریەوە کردوە و نیشانەی بەتوانایی و ئاگادارییان بووە، بەشێوەیەك توانیویانە ئەو بیر و زانیاریانەی پێش خۆیان لە بۆتەی بیری خۆیانا قاڵ بکەنەوەو لە ئاوی زێڕی زمانەکەیان بەشێوەیەکی نوێ دایبڕێژن کە بە ئاسانی هەست نەکرێ بە بیرە وەرگیراوەکە، وەرگرتنی فیکرە مەعنای قابلییەتە و عیلمە مەعنای وایە عالم بوون لە رێگای خوێندەواری و رۆشنبیریەوە، ئەو بیر و باوەڕانە، ئەمجا هێناویانە لەگەڵ بیرو باوەڕ و فیکری خۆیانا ئاوێتەیان کردووە)[56] ئەم جۆرە کاریگەریە هەوڵ و خۆ خەریك کردنی دەوێ و بریتی نییە لە جووینەوەی قسەی خەڵکی و بەس، بەڵکو دەبێ لەگەڵ وەرگرتنەکەدا تازەیی نوێ کردنەوەو جۆرە داهێنانێکی پێوە دیار بێت نرخی ئەوی پێشتر زیاد بکات و خۆشی بەنرختر بێت.

## کاریگەری ئەدەب و زمانی عەرەبی

خاسیەتێکی دیاری قوتابخانەی شیعری کلاسیکیی ناوچەی سلێمانی ئەوەیە کە لە گەلێ رووەوە کاریگەری ئەدەب و زمانی عەرەبی پێوە دیاربێت، نالی و سالم و کوردی ئەگەرچی شیعرەکانیان بە کوردی نووسیوە، بەلاّم لە شیعرەکانیاندا وشە و زاراوەی زۆری عەرەبی و زمانەکانی تریان بەکار هێناوە. ئەم تایبەتیە بۆتە شێوازێکی یەکگرتوو لەلای هەموو شاعیرانی سەر بەم قوتابخانەیە، دەتوانین فەرهەنگێکی گەورە لە وشە و زاراوەی عەرەبی لەلای هەر شاعیرە دیاری بکەین لەو وشانە هەندێکیان ئەدەبی و هەندێکیان زانستی کە پێوەندی بە زانستە ئاینییەکانەوە هەیە وەك فیقھ و ئوسولّی دین و مەنتیق و فەلەکیاتیان بەشێوەی ئیقتیباس و تەلمیح و بەکار هێنراوون[57] لەلای نالی بەتایبەت و لەلای شاعیرانی تریش بەگشتی ئەو شیعرانەی کە لە (موناجات)و نزا و پاڕانەوەدا وتویانە هەموویان ئەنجامی ئەو کاریگەریەن کە ئاینی

---

[56] عەلائەدین سجادی، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، بەغدا، ١٩٧٨، ل ٨٨.

[57] دیوانی نالی، لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس، ل٥١.

ئیسلام لە ناخی دەروونیاندا کردوویەتی[58] هەر لەم دێڕەدا کاریگەری قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) بەدی دەکرێ :

نالی نییەتی سیحری بەیان، حیکمەتی شیعرە
ئـــــەما نییەتی قووەتی دڵ، قودرەتی ئینشا

لە نێوەی یەکەمی ئەم دێڕە شیعرەدا ئیقتیباس لە فەرموودەی پێغەمبەر هەیە کە دەفەرموێ (ان من الشعر لحکمه و ان من البیان لسحرا) ، هەروەها لە نیوەی دووەمیشدا ئیقتیباس لە ئایەتی (أأنتم انشآتموها، ام نحن المنشئون)هەیە[59] نالی و شاعیرانی تریش روناکبیرییان لە ئاینەوە وەرگرتووە و کەڵکیانە لەو چیرۆك و بەسەرهاتانە وەرگرتووە کە لە قورئاندا باس کراون نالی سەقافەتی بەرز و بڵاوی هەمیشە لە شیعرەکانیدا دەدرەوشێتەوە بەتایبەتی سەقافەتی ئاینی و مانا وەرگرتن لە چیرۆك و سەرگوزشتە قورئانییەکان. ئەم شیعرە ئیشارەتە بۆ چیرۆکی حەزرەتی یوسف لەو بەسەرهاتەوە وەرگیراوە[60]

ڕەوشەنی دیدە بە ئینسانە کە موژدەی قەدەمت
رەوشـــــــەنی دیدەیی غەم دیدەیی بەیتولحەزەنە

هەروەها

تۆ یوسفی نەو حوسنی لەسەر میسری جینانی
من پیر و فانی
لەم کولبەیی ئەحزانە نە زیندووم و نەمردووم
هەروا بەتەماتم

---

[58] دیوانی نالی، لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالكريمی مدرس، ل٥١

[59] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٨.

[60] محمد علی قەرەداغی، خوێندنەوەیەکی دیوانی نالی، بەیان، ژمارە(٤٧)، شوباتی ١٩٧٨، ل٢٢.

لەم رووەوە لەسەر نالی و کاریگەری ئاینی ئیسلام زۆر نووسین و لێکۆڵینەوە هەیە.[61] سالم و کوردی و شاعیرانی تریش هەر بەو شێوەیە گەلێ جار لە دێڕە شیعرەکانیاندا هێماو ئیشارەتیان بۆ ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر کردووەو گەلێ وشە و زاراوەی زمانی عەرەبیان تێکەڵ بە زمانی شیعری خۆیان کردووە

سلێمانم بـــــە تەمکین تامەکانت

لەناو مەهدی دلا بێ مثلی بەلقیس[62]

قامەتت سەروە بـــە گولزاری ئیرەم

سیبە روخسارت بە فیردۆسی نەعیم

خەم بووە قەدم بە شمشێری عـــەلی

قسمەتم عجزە بە تەقسیمی قەسیم[63]

ئەم کاریگەریە لەلای شاعیرانی ئەم قوتابخانەیە سەری کێشاوە بۆ بەکارهێنانی گەلێ هونەری رەوانبێژی و هونەرە ئەدەبیەکانی تر وەك مولەممەع و موستەزاد و تێهەڵکێش و ئیقتیباس و گەلێ هونەری تر. مولەممەع بەو شیعرە دەوترێ کە بە زیاتر لە زمانێك دەنووسرێ واتە دوو زمان یا زیاتر بۆ مولەممەع بەکار دەهێنرێ، ئەم هونەرە شیعریە لەناو نەتەوەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست و قەفقاس و ئاسیای ناوەراست و هەندێ لە هەرێمەکانی هیندستاندا باوە[64] نالی شیعری مولەممەعی کەمە ئەوی کە هەیە بە کوردی و بە عەرەبین .

---

[61] بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە ئەم هەولانە: د.ئەمین موتابچی، نالی و ئەدەبیاتی دراوسێ، رۆشنبیری نوێ، ژ١٠٧، ئەیلولی ١٩٨٥، عەلادین سجادی، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، بەغدا، ١٩٧٨، مەسعود محمد، چەپکێك لە گولزاری نالی، بەغدا، ١٩٧٦ن دیوانی نالی ، لێکۆلینەوە و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم بەغدا، ١٩٧٦، محمد علی قەرەداغی، خوێندنەوەیەکی دیوانی نالی بەیان، ژ٤٧، ١٩٧٨.

[62] دیوانی سالم،کوردی و مەریوانی، بەغدا، ١٩٣٣، ل٤٠.

[63] دیوانی سالم،کوردی و مەریوانی، بەغدا، ١٩٣٣، ل ٥٢.

[64] لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، ل١٩٩.

دەم دەم کە دەکا زاری پڕ ئازاری بە غونچە

بۆ دەعوەتی ماچی لەبی گۆیا دەمی نادا

(سهـــــــــــم الف القد فقد صاد فؤادی

صاد هو من عینة، قد صاد فسادا))[65]

بەڵام کوردی یەکێکە لە شاعیرە دەوڵەمەندەکانی هونەری مولەممەع وەکو بڵێی بە ئانقەست بڕیاری دابێ مولەممەع بە هەموو زمانەکانی ئاشنا دابنێ"[66]، لێرەدا تەنیا مولەممەعی کوردی و عەرەبیەکەی دەکەین بە نمونە و ئەوانی دی لە کاریگەری ئەدەبی نەتەوەکانی تردا لە جێگای خۆیدا باسیان دەکەین :

حۆریی ڕەوزی جینانی یا گوڵی باغی ئیرەم

((أم نجوم العرش أم شمس علت فوق العلم))

سەرکەشی عێلی گەلاڵی شۆخی بابان و عێڕاق

((نور ابصار العرب ظل رؤسأ العجم))

## کاریگەری زمان و ئەدەبیاتی فارسی

لەگەڵ ئەو هۆیانەدا کە لە سەرەتای ئەم باسەدا دیاریمان کرد بە توانایی و شارەزایی شاعیرانی کلاسیکیی کورد، بەتایبەت لە نالی و سالم و کوردی و تا شاعیرانی پاش ئەوانیش (لە زمان و ئەدەبیاتی فارسیشدا) شارەزاییەکی تەواویان هەبووە بەهۆی ئەوەی کە گەلێ لەو کتێبانەی کە لە مزگەوتەکاندا دەیانخوێند بەزمانی بێگانە بوون، هەروەها دیوانی شاعیرە بەرزەکانی فارسی لەوسەردەمەدا وەکو سەعدی و حافز و نیزامی و گەلێ شاعیر و ئەدیبی دی بۆ نمونە نالی ناوی گەلێ شاعیری لە بەیتەکانیدا هێناوە وەك شاهی، خاقانی، شوکت، شیرازی، محتشم، فیکرەت، صائب، جگە لەوەی کە بیرو وێنەکانی ئەوانی وەرگرتووە و بەشێوازی خۆی و بە زمانی کوردی

[65] لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، ل۲۰۱.

[66] سەرچاوەی پێشوو، ل۲۰٤.

دایڕشتۆتەوە، بیرەکانی ئەوانی نوێ کردنەۆتەوەو پارسەنگیەکی زیاتریش لە بیرەکانی ئەوان داوەتەوە.

زابیتەی تەبعم سوارە ئیدیعای شاهی هەیە
موحتەشەم دیوانە داوای تەختی خاقانی دەکا

ئەی واعیزی بارید چییە هەر وەك هەرەسی کێو
بەو وەعزە کەبایە هەموو هاتوویی بــــە سەرما

وەك دیاردەیەکی سروشتی بەرهەمی شیعری گەلێ شاعیر کاری کردۆتە سەر سالم بەتایبەت شاعیرانی پێش خۆی، ئەم کاریگەریە لە تێکهەڵکێش کردن و تێکەڵاوی نیوە دێڕێك یان بەشێکی شیعری شاعیراندا دەبینرێ لە غەزەل و پارچە شیعرەکانی سالم دا.

الا یا ایها الساقی بە مفلس وەختی ئیحسانە
ادر کآســــا و ناولها عەتا شێوەی کەریمانە

یان بەشێوەیەکی تر ئەو دێڕە شیعرانەی قەسیدە بەناوبانگەکەی حافزی تێهەڵکێش کردووە و مانا و مەبەستی لێك داونەتەوەو بۆچوونەکانی فراوانتر کردووە و دەڵێ :

بەدەل کەین بابە نەشئەی مەی خوماری میحنەتی دونیا
الا یـــــــــا ایها الساقی ادر کـــــــــــاسا و ناولها

لە غەزەلێکی تریشدا زۆر بەڕوونی کاریگەری (جامی) پێوە دیارە کە دەڵێ :

ڕووە یا گوڵ ئەمە یا بەرگی نەسرین
لبست أیــــــن یا شکر یا جان شیرین
هەموو شەو تا سەحەر دڵ بۆ خەیاڵت
حیــکایت میکند بوتخانــــــــەئی چین
چ نەقاشــــــێ ئەتوێ لێکدا لەگەڵ روو
تــــــعــــــــالی خلق الانسان من طین

لێرەدا سالم تا رادیەك پێڕەوی (استقبال)ی قەسیدەیەکی جامی کردووە کە دەڵێ :

قامت است این یا الف یا سرو یا نخل مراد
یــــــا مطر گلدستە باغ جهان اراست این

د.ئەمین موتابچی لە لێکۆڵینەوەیەکیدا ئەم کاریگەریەی جامی لەسەر مەلای جزیریش دیاریکردووە کە جزیری دەڵێ :

یا رب این گلد ستە نرگس رعنا است این

سرو گلشن یا الف یا قامت یکتا است این[67]

جگە لەمانە سالم کۆمەڵێك غەزەلی هەیە، کە بریتین لە مولەممەع، نیوە دێڕی یەکەمی غەزەلەکان هەموویان بە زمانی کوردین و نیوە دێڕی دووەمیان بە زمانی فارسین[68] ئەمە جۆرە هونەرێکە لە مولەممەعی ئاسایی چۆتە دەرەوە، سالم داهێنان و هونەرێکی نوێی تیا بەکار هێناوە (تاکە دێڕە شیعرەکان هەریەکەیان مەلەممەعێکن، هەروەها تەواوی هەر غەزەلێکیش مولەممەعە[69].

دڵە خەڵوەت سەرایی حەزرەتی دووست

دیـــــدە آینە دار طلعت أوســـــت

هەر بەو شێوەیە ئەدەبیاتی فارسی کاریکردۆتە سەر مستەفا بەگی کوردی و شیعرەکانی، ئەگەر چاوێك بە دیوانەکەیدا بگێڕین گەلێ وشە و زاراوەی زمانی بێگانەی تیا بەدی دەکرێ. جگە لە مولەممەعە بەناوبانگەکەی کە لە غەزەلی (خۆشم قوربان . . . ) بریتیە لە هەشت دێڕ نیوەی یەکەمی هەموو دێڕەکان کوردین.

خۆشم قوربان بە بەندیخانە و زنجیرو سێدارەت

((بشرط آنکە نیاری برسر من طعن اغیارت))[70]

کوردییش وەك هەموو رۆشنبیرێکی سەردەمی خۆی شیعر و بەرهەمی شاعیرانی فارسی خوێندۆتەوە و کاریگەری ئەو بەرهەمانە لە شیعرەکانی کوردیدا رەنگیان داوەتەوە و ئەمە جگە لە هاتووچۆ و سەردانی مستەفا بەگ بۆ هەندێ شار و ناوچەی ئێران و ئاشنایەتی لەگەڵ خوێندەوار و رۆشنبیر و شاعیراندا پەیدا کردووە.

---

[67] د.ئەمین موتابچی،(کورتە بەراوردێ)، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق،دەستەی کوردی،بەرگی ١٦,١٧،ل٤٤.

[68] لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردی، ل٢٠٢.

[69] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٢.

[70] دیوانی کوردی، ل٢.

## کاریگەری زمان و ئەدەبیاتی تورکی

سەردەمی ژیانی شاعیرانی ئەم قوتابخانەیە کەوتبووە ئەو رۆژگارەی کە ئەم ناوچەیە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوو، زمانی رەسمی ئەم دەوڵەتە توورکی بووە، جگە لەوەی کە هەندێ کتێب و نوسراو لەناو خوێندەوارانی ئەم ناوچەیەدا بە زمانی تورکی لە ئارادا بوون. هەروەها هۆیەکی گرنگیش بریتی بووە لە شارەزایی و بەتوانایی شاعیرانی کورد خۆیان، کە هەوڵیان داوە ئەم زمانە و چەند زمانێکی تریش فێر بن بەتایبەت خوێندنەوە و تێگەیشتن و وەڵام دانەوەی ئەو نامە و نوسراوانەی کە لەنێوان میر و گەورەپیاوانی کورد و فەرمانڕەوا تورکەکاندا هەبووە ئەم هۆیە بەتەنیا لەو قاڵب و چوارچێوەیەدا نەماوەتەوە، بەڵکو زمانی تورکیش هەر وەك عەرەبی و فارسی خۆی کردووە بەناو زمانی ئەدەب و شیعریشدا، شاعیرانی کورد لەم زمانەشدا سوارچاکی خۆیان دەرخستووە. نالی ئەگەر بۆماوەیەکی کەمیش بووبێ لە ئەستەمبوڵ ژیاوەو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. ئەگەرچی لەلای نالی[71] و سالم غەزەل یا قەسیدەیەك بە زمانی تورکی تا ئێستا بەرچاو نەکەوتووە یان نەدۆزراوەتەوە، بەڵام لە زۆر دێڕە شیعریاندا وشە و زاراوەی تورکی بەرچاو دەکەوێ، بەڵگە نەویستە کە شاعیرانی ئەم قوتابخانەیە زمانی تورکیان زانیوە و زمان و ئەدەبی تورکی کاری کردۆتە سەر شیعر و ئەدەبیاتیان بۆنمونە نالی لەم دێڕەدا دەڵێ :

گیل ئەگەر تورکی، (تعال) ئەر عەرەبی
بێ ئەگەر کوردی، ئەگەر فارسی بیا

ئەگەر نالی هووشەو موبالەغەی نەکردبێ ئەوا ئەم چوار زمانەی زانیوە بۆیە ئامادەیە بە هەر چوار زمانەکە خۆشەویستەکەی بانگ کات و بیدوێنێ. ئەم وشە و

[71] بۆزانیاری زیاتی لەبارەی نەبوونی شیعر بە زمانی تورکی لەلای نالی بڕوانە: دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، ل٢٢، ٢٣.

زاراوە تورکیانەی لەلای نالی و سالم لە شیعردا بەکارهێنراون بۆ نمونە بریتین لە (ئاغوش، یەغما، بوغاز، ئوشاخ، یولداش، تورك، . . . هتد) لەلایەکی تریشەوە رووداوی مێژوویی گرنگ بەڵگە نەویستە کە کاریگەری هەبووە لەسەر بەرهەمی شیعری شاعیران، وەك هێرشی تورکەکان بۆ ناوچەی سلێمانی و داگیرکردنی شاری سلێمانی و لەناوبردنی میرنشینەکەی. ئەو کارەسات و کوشت و بڕو ناهەمواریەی بەسەر ئەم ناوچەیەدا هات بەتایبەت سلێمانی لە شیعر و ئەدەبیاتی شاعیراندا رەنگی دایەوە بەتایبەت لەلای نالی و سالم. ((ئەگەر بەرهەمەکانی نالی شاعیر ئاوێنەی هەندێ لە رۆژە زێڕینەکانی شاری سلێمانی بێت، ئەوا لە شیعرەکانی سالمی هاوڕێیدا تۆمارێکی گەورەی میرنشینەکەی بابان و شاری سلێمانیمان بەرچاو دەکەوێ هەر لەسەرتای کارەساتی لەناوبردنی میرنشینەکەیەوە تاوکو چەند ساڵێکیش دوای ئەو کارەساتە))[72]، نمونەی ئەم مەبەستانە لە دوو چامەکەی نالی و سالمدا و لە هەندێ قەسیدەی قارەمانییەتی لای سالم دەردەکەوێ.

چـــاوی عیبرەت هەڵبڕە ئەی دڵ لە وەزعی دەهری دوون
سەیری کە رۆمی دەڵەك چی کرد بە زومرەی کورد زمان
سەن سەنی سوارەی نیزامی گێل (ئولان)ی تورك ئوشاخ
بــــــگرە بـــــــگرەی کورد زمان ئاخ ئاخی تورکمان

ئەم کاریگەریە لەلای شاعیرانی دەستەی دووەمیش بەرچاو دەکەوێ بەتایبەت شێخ رەزا.

مستەفا بەگی کوردی جگە لە بەکارهێنانی وشە و زاراوە، کاریگەری زمانی تورکی سەریکێشاوە بۆ ناو غەزەلێکیشی کە بریتیە لە نۆ دێڕە شیعر نیوە دێڕی یەکەمی هەموو دێڕەکان کوردیە و نیوە دێڕی دووەمی هەموو دێڕەکان تورکیە کە دەڵێ :

دیسان وا هاتە گەردش چەرخی چاوی مەستی فەتتانی
((گیول اقلیمك اوزره برده سوردی صفی مژگانی))

---

[72] دڵشاد عەلی، سلێمانی، لە روانگەی شیعرەوە، رۆشنبیری نوێ، ژ ١١٢، ساڵی ١٩٨٦، ل٥٩.

بەتابووری مژە زانیم لەگەڵ دڵ دێ بەشەڕ چونکە

((یوروش آسابە در غوغایە فرق سنك دورانی))[73]

شێوازێکی یەکگرتوو تایبەت تەنانەت لە هونەری مولەممەعەکەشدا لەلای هەر سێ شاعیرەکە دەردەکەوێ و وەك یەکیەکیان تیایە کە ئەویش ئەوەیە زمانی دووەمی مولەممەعەکە هەر زمانێ بێ، زمانی یەکەم و نێوە دێڕی هەموو مەلەممەعێك بە زمانی کوردی دەستی پێ کردووە لەلای هەر سێ شاعیرەکە.

## کێش و قافیە لەم قوتابخانە شیعریەدا

**کـێـش** :

لاسایی کردنەوە و پێڕەوی کردنی ڕێو شوێنی شیعری کلاسیکیی عەرەبی و ئیسلامی یەکێکە لە خاسیەتەکانی شیعری کلاسیکیی کوردی، بەرهەمی شیعری شاعیرانی ئەم قوتابخانەیەش بە زۆری بریتیە لە غەزەل و قەسیدە کە لە رووی شێوە و فۆرمی داڕشتنییەوە پەیڕەوی یاسا و دەستووری شیعری (عمودی) کێش و قافیەداری کردووە.

پێناسەی زانستی عەروز لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا بەگشتی تا رادەیەك لە یەکەوە نزیکن و سەرجەم لەم پێناسەیەدا یەکدەگرنەوە[74] ( زانستی عەروز ئەو زانستەیە کە کێشانەی شیعری پێ دەکرێت لە رووی کێشەوە، بۆئەوەی دروستی و لاسەنگی ئەو شیعرە دەرکەوێت لەگەڵ دەست نیشان کردنی کەم و کورتیەکاندا) ئەم زانستە کە ناونراوە عەروز تایبەتە بە شیعری عەرەبی و شیعری ئەو نەتەوە موسوڵمانانەی کە لە شیعریاندا پێڕەوی ڕێبازی شیعری عەموودیان کردووە. ئەم زانستە و زاراوەکانی

---

[73] لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردیەوە، ل٢٠٦.

[74] بڕوانە ئەم سەرچاوانە: د. صفاء خلوصی، فن التقطيع الشعری و القافية، التقطيع، ج/١، بغداد،١٩٦٣، الصاحب ان القاسم اسماعيل بن عباد، الاقناع فی العروض و تخريج القوافی، تحقيق الشيخ محمد حسين ال ياسين، بغداد، ١٩٦٠.

پێوەندیەکی سروشتی هەیە بە نەتەوەی عەرەب و ژینگە و باری ژیان و سروشتی ناوچەکەیانەوە.

لە ئەدەبی عەرەبیدا سەرەتا کێشی شیعر لەلایەن خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی بەسرییەوە دۆزرایەوە و دەستورەکانی ڕێکخران. لە پاش ئەو گەلێ لێکۆڵینەوەی زانستیانە لەبارەی ئەم زانستەوە بە ئەنجام گەیشتووە[75].

لە ئەدەبی کوردیدا ئەم زانستەیان پشت گوێ نەخستووە و بەپێی توانا و ڕادەی ڕۆشنبیری خۆیان کەم تا زۆر لێی دوواون، سەرەتا ئەحمەدی خانی لە نۆبهارەکەیدا پارچە شیعرەکانی لەسەر کێشەکانی زانستی عەروز داناوەو لەسەرەتای پارچە شیعرەکانیدا بە دێڕێك یان دوو دێڕ باسی ئەو بەحرانەی کردووە کە شیعرەکانی لەسەر داناوە[76]، شێخ معروفی نۆدێی نووسراوێکی بەزمانی عەرەبی و بەنەزم سەبارەت بە زانستی عەروز نووسیوە[77] هەرچەندە ئەم بەرهەمە بە کوردی ناژمێردرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لە حوجرەو مزگەوتەکانی کوردستاندا خوێندراوە و بەرهەمی زانایەکی ئاینی و ئەدیبێکی کورد بووە، زۆر بە وردی و تەواوی باسی هەموو بەحرەکان و لایەنەکانی ئەم زانستەی کردووە. بێگومان کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر بەرهەمی شاعیرانی ئەم قوتابخانەیە و بەتایبەت کە لە یەك مەڵبەند و ناوچەشدا ژیاوون.[78] شێخ نووری شێخ صالح کۆمەڵە وتارێکی لەڕۆژنامەی ژیاندا بڵاوکردۆتەوە، لەبابەت ئەو کێشانەی کە کورد بەکاریان هێناوە لەرووی مێژوویی و سەرەتای باسکردنی ئەم بابەتە لە ئەدەبی کوردیدا بە یەکەم سەرچاوە و نووسینێکی ڕەخنەی ئەدەبی زانستیانە دادەنرێ.

د.مارف خەزنەدار لەساڵی ١٩٦٢دا کتێبێکی بەناوی ( کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا) لەچاپ داوە [79]ئەم بەرهەمە بە یەکەم کتێبی کوردی دادەنرێ کە تایبەتە بە

---

[75] بۆ نمونە بڕوانە ئەم سەرچاوانە: الاقناع فی العرض و القوافی، فن التقطیع الشعری و القوافی، الشیخ جلال الحنفی، العرض تهذیبة و اعادة تدوینه، ١٩٧٨.

[76] نوبهارا سەیدانی مەزن ئەحمەدی خانی، صادق بهاءالدین، بغدا، ١٩٧٩.

[77] الاعمال الکامله للشیخ معروف النودهی، تحقیق مجموعه من وزاره الاوقاف، القسم السادس، المتفرقات، بغداد، ١٩٨٨.

[78] بڕوانە ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە ٢٧، ٣١، ٣٢،، ئاب و ئەیلولی ١٩٢٦.

[79] د.معروف خەزنەدار، کێشی قافیە لە شیعری کوردیدا، بەغدا، ١٩٦٢.

زانستی عەروز و چۆنییەتی کاریگەی ئەم زانستەی روون کردۆتەوە لەسەر شیعری فارسی و کوردی و رێنووسی دەنگەکان بەپیتی عەرەبی و لەبارەی چۆنییەتی بڕگە کردنیانەوە دوواوە لەم رووەوە بە لێکۆڵینەوەیەکی سەرکەوتوو دادەنرێ، چونکە لە روانگەی زانستی فۆنێتیکەوە دەڕوانێتە ئەم بابەتە. عەلائەدین سەجادی لە نرخ شناسیەکەیدا[80] لە دوو شوێندا باسی عەرەزی کردووە. هەردی لە گۆڤاری برایەتیدا لە ژێر ناوی (کێش لە شیعری کوردیدا)[81] لێکۆڵینەوەیەکی بڵاوکردۆتەوە د.ئیحسان فوئاد لە گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، زانستگای بەغدا باسێکی بڵاوکردۆتەوە لەژێر ناونیشانی ( دووکێشی عەروز لە شیعری کوردی تازەدا)[82]ئەم نوسیەنە تایبەتە بە شیعری تازەی کوردیەوە. عەبدولرەزاق بیمار لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێدا لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی بەناوی ( عەروز لە هەڵبەستی کوردیدا) بڵاوکردۆتەوە[83]. ئێمە لێرەدا نامانەوێ درێژە بەم باسە بدەین بەوەی کە رەخنە و هەڵسەنگاندنی ئەو بەرهەمانەی پێشتر باسمان کرد بخەینە روو، چونکە ماوەو لێدوانێکی زۆری دەوێ، بەڵام ئەوە دیاری دەکەین کە بەگشتی زۆربەیان کە باسی عەروزو کێش و تەنانەت قافیەش دەکەن، حساب و مامەڵەیان لەگەڵ ( حەرف، تیپ، پیت یا رێنووس)دا کردووە، بەڵام شێخ نوری شێخ سالح دەنگ بە بەردی بناغەی کێش دادەنێ[84]و لە هەموو باسەکانیدا لەم رووەوە وەك دەنگ مامەڵە لەگەڵ کێش و قافیەدا دەکا نەك تیپ و ژمارەی تیپەکان. بۆیە دەبێ لەلێدوان و باسکردنی کێش و قافیە و شیکردنەوەی شیعر لەم رووەوە وەك دەنگ مامەڵە لەگەڵ ئەو بابەتانەدا بکرێ، چونکە بەلای ئێمەشەوە وەك دڵشاد عەلی دەڵێ (ئەگەر شیعر بەشێوەی نووسراویش بخرێتە بەر دەست خوێنەر ئەوا هەر دەبێ وەك هونەرێکی دەنگی مامەڵەی لەگەڵ بکرێ[85] وەك لەوەوبەر وتمان ئەم

---

[80] عەلائەددین سجادی، نرخ شنایی، بەغدا، ١٩٧٠، ل٢٠ تا٢٩ و ل٩٧ تا ١١٠.

[81] ئەحمەد هەردی، کێش لە شیعری کوردیدا، گۆڤاری برایەتی، ز١٠٠ خولی دووەم، ١٩٧١.

[82] د.ئیحسان فوئاد، دوو کێشی عەروز لە شیعری کوردی تازەدا، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، زانستگای بەغدا، ژ١٥،بەغدا، ١٩٧٢.

[83] عبدالرزاق بیمار، کێش لە هەڵبەستی کوردیدا، رۆشنبیری نوێ، ژ١١٣، ساڵی ١٩٨٧.

[84] بڕوانە وتاری ژمارەکانی ٢٧، ٣١، ٣٢ی رۆژنامەی ژیان، ئاب و ئەیلولی ١٩٢٦.

[85] دڵشاد علی محمد، (بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا)، نامەی ماجستێر، ١٩٨٨، ل١٠٦.

زانستە تایبەتە بە شیعری ستوونی عەرەبییەوە، نەتەوەی کوردیش وەك نەتەوەکانی تر بەهۆی کاریگەری ئەدەب و زمانی دراوسێکانییەوە ئەم زانستەی وەرگرتووە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم نەتەوانە و شاعیرانی کوردیش کوتومت بەبێ دەستکاری کردن ئەم کێشانەیان وەرگرتبێ، بەڵکو بەپێی سروشتی زمانەکانیان گەلێ کێشیان لێ فرێداوە، جگە لەوەی ئاوازی زمانەکەی خۆیانیان بەسەر هەندێ کێشی عەرەبیدا سەپاندووە.

کێشەکانی عەروز بریتین لە شانزە بەحر ئەمانەن : طویل، بسیط، مدید، وافر، هزج، رجز، رمل، سریع، منسرح، خفیف، مضارع، مقتضب،مجتث، متقارب، متدارك. وەك لەوەوبەر وتمان ئەم بەحرانە لەلای شاعیران دەستکاری کراون یان هەندێکیان بەکار نەهێنراوە ئەگەر بەکاریشیان بردبێ زۆر بە کەمی بووە، تەنانەت شاعیرە عەرەبەکانیش ئەم گۆڕان و دەستکاری و بەکار نەهێنانەیان کردووە، بۆ نمونە کێشی (رمل) لەلای شاعیرە عەرەبەکان کەم بەکار هێنراوە، ئەگەر بەکاریش هاتبێ ئەمانیش بەپێی سروشتی زمانی عەرەبی دەستکاریان کردووە لێرەدا رایەکی گۆستاف دێنینەوە کە دەڵێ ( چۆن ئەم دیاردەیە شی دەکەینەوە؟ ئەویش ئەوەیە کێشێك لەناوچەی (حیرە)دا نشونمای کردووە و لە شوێنانی دیکەی وڵاتی عەرەبیدا پشتگوێ خراوە. بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە دەڵێ (کێشی رەمەلی هەشت هەنگاوی لە دراوسێکانی ئەم ناوچەیەوە وەرگیراوە[86]کەواتە لە شیعری ئەونەتەوانەوە وەرگیراوە کە کەوتونەتە رۆژهەڵاتی عەرەبەکان. بۆ روون کردنەوەی هەندێ زاراوەو زانیاری پێویست دەبێ لە شیکردنەوە و دیاریکردنی شیعر و ئەو زاراوانەی کە بۆی دانراوە دەست پێ بکەین. بەپێی زانستی عەروز شیعر بریتیە لە نووسینێکی کێش و سەروادار کە دێڕە شیعر یا (بیت) پێك دێنێ. دێڕیش لە دوو پارچە پێك دێ کە هەریەکێ لەم پارچانە پێی دەگوترێ نیوەدێڕ (شطر، یا مصراع) بە یەکەم دەوترێ (صدر) و بە دووەمیش دەوترێ (عجز) هەر نیوە دێڕێکیش لە چەند هەنگاوێك (تفعیلە) پێك دێ، بە دوا هەنگاوی نیوە دێڕی یەکەم دەوترێ (عەروز)و دوا هەنگاوی نیوە دێڕی دووەم (ضرب)ی پێ

---

[86] گۆستاف فون غرنباوم، دراسات فی الادب العربی، ترجمە الدکتور احسان عباس، الدکتور انیس فریحە، الدکتور محمد یوسف نجم، الدکتور کمال یازجی، بیروت، ١٩٥٩، ل٢٦٦.

دەڵێین[87]، ئەم هەنگاوانەش لە یەکگرتنی (سەبەب و وەتەد و فاسیلە) پەیدا دەبن کە هەر یەکەیان دوو جۆری هەیە. لە زانستی عەروزی عەرەبیدا گەلێ ناو و زاراوەی جۆراوجۆر بەکار هێنراوە لێرەدا بەپێویستی نازانین باسیان بکەین.

لە زمانی کوردیدا ئەو زاراوانە بەتایبەت ئەو سیانە (سەبەب و وەتەد و فاسیلە) بەرامبەر (بڕگەن) کە دەبنە بنچینەی ئەم کێشانە. بڕگەش وشەی لێ دروست دەکرێ. ئەم بڕگانەش بەپێی تایبەتێتی و سروشتی زمانەکە بەرچاو دەخرێ بۆنمونە لە زمانی کوردیدا (بڕگە لە دەنگی بزوێن و نەبزوێن پێکدێ، بڕگە بریتیە لە کۆمەڵە دەنگێك کە یەکێکیان لە هەموویان دەرکەوتوو تر بێت[88]، ئەم بڕگانەش بەپێی چۆنییەتی و تایبەتی زمان یەکدەگرن و لە زانستی عەروزدا بەو یەکگرتنانە دەوترێ ( سەبەب و وەتەدو فاسیلە) ئەمانیش هەر یەکەو دوو جۆری هەیە. بە لێکدان و خستنە پاڵ یەکی ئەو سەبەب و فاسیلە و وەتەدانە هەنگاو دروست دەبێ، زانایانی عەروزی عەرەبی ئەم هەنگاوانەیان بە (التفاعیل) ناو بردووە کە بریتین لەم هەشت دانەیە ( فعولن، مفاعیلن، فاعلاتن، مفاعلتن، فاعلن، مستفعلن، متفاعلن، مفعولات)، دوو هەنگاو لەمانە تووشی نەخۆشی و کشان دەبن شێوەیەکی جیاواز وەردەگرن و دەبن بە (فاع لاتن و مستفع لن).

لێرەدا بە کورتی دەتوانین بڵێین (بڕگەی کوردی) و بڕگە کردن بۆ کێشانی شیعر بە بەحرە عەروزیەکان جێگای ئەو هەموو زاراوە و نیشانە و ئاڵۆزیانەی عەروز دەگرێتەوە. لە زمانی کوردیدا ئەم بڕگانە دەنگە بزوێنەکان سنوریان بۆ دەکێشن و بەپێی شوێن و جێی بزوێنەکان جۆری بڕگەکە دیاری دەکرێ لەرووی کورتی و درێژییەوە :

١. بڕگەی کورت لە زانستی عەروزدا ئەم نیشانەیەی بۆ دانراوە ( ـ ).

٢. بڕگەی درێژ ئەم نیشانەیەی بۆ بەکاردێ ( __ )

دەنگە بزوێنەکانی زمانی کوردی جێگای جووڵەکان (سەرو بۆرو ژێر)ی زمانی عەرەبی دەگرنەوە. لەزمانی کوردیدا سێ جۆر دەنگە بزوێنمان هەیە :

١. کورت ( ــە - و — i ) ئەو (ی) کورتەی لە من و دڵ دا هەیە.

---

[87] فن التقطیع الشعری و القوافی، ص٢٣، کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، ل١٩.

[88] محمد معروف فتاح، زمانەوانی، هەولێر، ١٩٨٧، ل٦٣.

٢. بزوێنە درێژەکان : ( ا - و - وو — ێ ، ی).

٣. بزوێنی دوولانە : ( Ö) لە نوێن، جوێن[89].

"بڕگە کردن و تەفعیلە دانان"

کە ویستمان شیعرێك بە تەرازووی عەروز بکێشین پێویستە پێڕەوی ئەم خاڵانە بکەین :

١. شیعرەکە بە ڕێنووسێکی عەروزانە دەبێ بنوسرێتەوە نەك ڕێنووسی ئاسایی ئەویش بەم شێوەیە ئەبێ :

أ. ئەگەر شیعرەکە عەرەبی بوو یا وشە و زاراوەی عەرەبی تیا بوو دەنگە گیراوەکان (شدە دار) بوون ئەبێ بە دوو دەنگ بنوسرێن لە شێوەی خۆی دەنگی یەکەمیان نەبزوێن کەین و دووەمیان ببزوێنین.

ب. کە (تەنووین)مان هاتە ڕێ دەبێ بەگوێرەی دەنگەکەی بینووسین وەك (رجل) پێویستە بەم شێوەیە بنوسرێ (رەجولون).

٢. هەر دەنگێکی بزواو بەتەنیا هات ئەگەر عەرەبی بوو، وە لە کوردیدا بزوێنە کورتەکانی لەگەڵدا بوو ئەوا ئەم نیشانەیەی بۆ دائەنێین ( ب ) واتە بڕگەی کورت. هەر دەنگێکی بزواو نەبزواوێکی بەدوادا هات یا بزوێنێ لە نێواز دوونە بزوێنی دەنگە کورتەکاندا بوو ئەوا ئەم نیشانەیەی بۆ دادەنێین ( __ ) واتە بڕگەی درێژ, واتە یەکەم بریتیە لە یەك دەنگی عەرەبی بەسەرو بۆرو ژێرەوە و دووەم بریتیە لە دوو دەنگ هەر بەو شێوەیە.

٤. شیعرەکە بڕگە بڕگە دەکەین ئەوجا لەژێر هەر بڕگەیەکدا نیشانەی خۆی دادەنێین، لەو نیشانانەی لە خاڵی دووەمدا دیاریمان کردن. ئەنجا نیشانەکان کۆمەڵ کۆمەڵ کۆدەکەینەوە هەر کۆمەڵە بەجیا دایدەنێین کەوا روو ئەدا ٤، ٣، ٤، ٣ بێت یان ٣، ٤، ٣، ٤ یان ٤، ٤، ٤، ٤ بێت.

٥. دوای ئەوەی ئەم کۆمەڵانەمان دەرکرد بەپێی هەنگاوەکان (تەفعیلەکان) کێشەکان دەدۆزینەوەو بەپێی بازنەی خەلیل بەحرەکەی دیاری دەکەین.

---

[89] محمد معروف فتاح، ڕێنووسی کوردی لە روانگەی فۆنەتیکەوە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کوردی، بەرگی نۆهەم، ١٩٨٢، ل٢٣٨.

باشترین رێگا بۆ کەرت کردنی وشەکان و دۆزینەوەی ئەو کێشە عەرەبیانەی شیعری کوردی لەسەر وتراوە ئەم رایەیە کە دەڵێ ( هەرکەسێ بیەوێ بزانێ هۆنراوەی کوردی ئەچێتە سەر چ کێشێکی عەرەبی راستر وەهایە لەسەر یاسایەکی دەنگی وشەکان کەرت (تقطیع) بکا و ئەنجا بیخاتە پاڵ کێشەکانەوە، واتە بە سەلیقەیەکی دەنگ ناسی کێشەکان بدۆزێتەوە، نەك یاسای کەرتی بەکار بهێنێ)[90] پاش دۆزینەوەو کێشانی شیعرەکە ئەوسا دەردەکەوێ ئەو شیعرە لەسەر چ کێشێکە و، ئایا تەواوە یا لاسەنگە.

ئێمە لێرەدا تەنیا بۆ نمونە و بەتایبەت لەو کێشانە دەدوێین کە بەزۆری لەلای شاعیرانی قوتابخانەی ناوچەی سلێمانی بەگشتی بەکارهێنراون و بریتین لە رەمەل و هەزەج. هەرچی بەحرەکانی ترە لە شیعری ئەم قوتابخانەیەدا دەبینرێ، بەڵام زۆر بە کەمی.

یەکەم : کێشی رەمەل (هەشت هەنگاوی مەحزووف)

هەنگاوەکانی ئەم بەحرە بەم شێوەیە دەبێ :

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

بۆ نمونەئەم دێڕە شیعرە بڕگە بڕگە دەکەین و دەیکێشین.

تا فەلەك دەورەی نەدا سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو

کەوکەبی میهری موبارەك تەلعەتی پەیدا نەبوو (نالی)

تا / فە / لەك / دەو / رەی / نە / دا / سەد / کەو / کە / بی / ئا / وا / نە / بوو

| — ب — — | — ب — — | — ب — — | — ب — |

| فا ع لا تن | فا ع لا تن | فا ع لا تن | فا ع لن

دووەم :

أ : هەزەجی، هەشت هەنگاوی

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

---

[90] رؤوف شێخ عثمان، چەند سەرنجێك دەربارەی (کێش لەش یعری کوردیدا)، برایەتی، ژ(١)، سالی(٢)، جوزەیرانی، ١٩٧١، ل٤٩.

له کونجی سینه دەنگی ئای و ئۆی دڵ دێ بە مـەحزونی
وێران بێ نەمدی ساتێ لێی نەیەت ناڵــــــەی برینداری ( کوردی)

لەگەڵ دڵ شەرتە ســـاڵم گەر نـــەجاتم بێ لە تارانا
بەهەشت ئەر بێتە دەشتی رەی بە ئێرانا گوزەر ناکەم ( ساڵم)

ب : هەزەجی شەش هەنگاوی (مەحزوف)
وەکــو یەك دێتە بەر گوێی پیاوی ئەحمەق
صەفیری بولبولو ئـــــاواز لـــــەق لەق (ساڵم)

ج. هەزەجی هەشت هەنگاوی (ئەزرەبی مەکفوف مەحزوف)
مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن
گریانــی من و خەندەیی تۆ ئێستە دەشوبهێن
بەو مەوسیمی بارانە کەوا غونچە دەپشکووت (نالی)

**********

جـــانا وەرە ئەم جەژنە بەقوربانی سەرت بم
بـــۆ تیری قەزای چاوی حەسودان سوپەرت بم (کوردی)

وەك لەوەوبەر روونمان کردەوە (کێشی عەروز) لە رێی ئەدەبی نەتەوە دراوسێکانەوە، روونتر بڵێین لە ئەدەبیاتی فارسەوە گەیشتۆتە شاعیرانی کورد، هەروەها ئەم نەتەوانە بەپێی سروشتی زمانەکانیان دەستکاری عەروزیان کردووە، ئەحمەد هەردی ئەم کێشە دەکا بە پاڵپشتی ئەو راستیەی سەرەوە و رەخنەش لە عەلادین سەجادی دەگرێ کە لە لاپەڕەکانی ١٢٥ – ١٢٧ی نرخ شناسیەکەیدا ئەم کێشە بە عەروز دانانێ، هەموو بەڵگەی سەجادیش ئەوەیە کە لە عەرەبیدا بەر چاو نەکەوتووە[91]جگە لەمە سێ کێشی (جدید، قریب، متشاکل) کە لە داهێنانی ئێرانییەکانن (تایبەتن بە غەیری

[91] نرخ شناسی، ل ١٢٥-١٢٧.

عەرەبەوە)[92] ئەو کێشانەش کە زیاد کراون گەلێ لەو سێ کێشەی سەجادی ناوی هێناون زیادترن. دیسان زەحافەکانی خەلیل بەشیان نەکردووە هێناویانە (١٣) زەحافی تریان داناوە[93] کەواتە ئەمانە هەمووی بەڵگەی زانستین بۆ ئەو رایەی کە ئەم شاعیرانە و شاعیرانی نەتەوەکانی تریش بەپێی سروشتی زمانەکەی خۆیان کێشی تایبەتی خۆیان هەیە و کوتومت پەیڕەوی کێشەکانی عەروزی عەرەبیان نەکردووە.

"هەزەجی هەشت هەنگاوی ئەزرەب"

مفعول مفاعیلن مفعول مفاعیلن

تـــالآنی سەرو ماڵم چاوی رەشـــی فەتتانت

پـــــابـــەندی دڵ و دینم کاکۆڵی پەرێشانت (کوردی)

گەردەن کەچی زوڵفی بووی، سا دڵ مەدە بەر موژکان

وا خۆت لە تەناف داوە، ئیتر لـــــە قـــەنارەت چـــی ( نالی)

زۆربەی شاعیران بەتایبەت ئەم قوتابخانە شیعریە شارەزاییان لە زانستی عەروزدا هەبووە، بەڵام لەبەر ئەوە نەبووە کە شاعیر بوون، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەم زانستە لە مزگەوتەکاندا خوێنراوەو، ئاگاداری دەستورو بنەماکانی ئەم زانستە بوون، بەڵام ئەم شارەزایی و زانینە مەرج نەبووە و مەرجیش نییە بۆ هەموو شاعیرێك کە بیزانێ. کەواتە ئەوی پێوستی بەم زانستە بێت رەخنەگرو لێکۆڵەرەوەکانە نەك شاعیران، هەروەك عەرەب دەڵێ پێش ئەوەی خەلیل بەحرەکانی عەروزی عەرەبی بدۆزێتەوە شیعری رەوان و دروست و بەهێزیش هەر هەبووە.

((قد کان نظم الوری صحیحا

من قبل آن یعرف الخلیل))

هەروەها کێشی عەروز ئەگەرچی بۆ عەرەبی دەست ئەدا، بەڵام بۆ شیعری کوردی کەڵکێکی ئەوتۆی نییە و بوونی تەنیا لەبەر ئەوەیە لاسایی کردنەوەی دەستوور و یاسا

---

[92] نرخ شناسی، ل ٩٧-٩٨.

[93] کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، ل٢١.

و بنەماکانی شیعری ستونی عەرەبیە وەك وەرگرتن و لاسایی کردنەوەی لایەنەکانی تری ئەدەب بە گشتی.

## قــافیـه

سەبارەت بە قافیە گەلێ پێناسە هەیە. لەسەرەتاوە خەلیلی ئەحمەدی فەراهیدی و ئەخفەش، هەریەکەیان بەجۆرێ لێی دواون. لە ئەدەبی کوردیشدا نووسەران و لێکۆڵەرەوانی ئەدەب بەش بەحاڵی خۆیان لەم بابەتە دواون. شێخ نوری شێخ ساڵح دەڵێ : (( قافیە لە نهایەت هەموو مەسرەعێکدا لەبینی هیجای ئاخریدا بە ئیعتباری تصوت عبارەتە لە متابقەت))[94]، وەك لە باسی کێشدا دەرکەوت لە قافیەشدا شێخ نوری وەك دەنگ مامەڵە لەگەڵ قافیەدا دەکا نەك وەك تیپ. جگە لەو پێناسەیەی شێخ نوری (( ئەو پێناسانەی کە لەبەر دەستماندایە بەتەواوی ناتوانن سیما و تایبەتێتی قافیەی هەڵبەستی کوردی دەست نیشان بکەن))[95]، ئێمە لێرەدا پێناسەی قافیە لە شیعری کلاسیکیی کوردی قوتابخانەی ناوچەی سلێمانیدا دیاری دەکەین نەك بە گشتی لە شیعری کوردیدا، تەنیا لەبەر ئەم هۆیە لە پێناسەکەی دڵشاد عەلی جیا دەبێتەوە. قافیە دەنگێ یا زیاتری دووبارە کراوەیە و دەکەونە کۆتایی دوا هەنگاوی هەموو دێڕەکانی ئەو پارچە شیعرەوە.

زۆر جار قافیە لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەمەوە دەست پێ دەکاو ریز دەبەستێ لەگەڵ کۆتایی نیوەکەی تری دێڕی یەکەم و کۆتایی هەموو دێڕەکانی تردا. بێگومان ئەو قافیانەی کە لە یەك دەنگ دروست دەبن ئەو دەنگانە تەنیا دەنگە بزوێنە درێژەکانن ئەگینا بەهیچ جۆرێك دەنگەکانی تری زمانی کوردی بەتەنیا قافیە دروست ناکەن.

---

[94] م.نوری، ژیان،ژ٣٢، ٩ی ئەیلولی ١٩٢٦.

[95] دڵشاد علی، بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا، ل١٠٨.

خالێکی گرنگ لە قافیەدا سەرنج رادەکێشێ ئەویش ئەوەیە کە ئەو دەنگانە کە دەبنە قافیە مەرج و پێویستە دەنگێکی سەرەکی و بەشی رەسەنی وشەکان بن، بەواتایەکی دیکە، ئامراز و نیشانەکانی مۆرفۆلۆژی کە دەچنە سەر وشەکان نابنە قافیە. بۆ نمونە نیشانەی کۆی(ان) لە وشەی ژنان لەگەڵ وشەی کوڕان هەروەها نیشانەی ناسراوی (ەکە) لە وشەی چاوەکە لەگەڵ دەمەکە نابێتە قافیە. جگە لەمە بۆ بەهێزی قافیە و تەواو کردنی کێش بەپێی بەحرەکانی عەروز پاش قافیەیان بەکار هێناوە کە ئەمیش بریتیە لە دووبارە بوونەوەی وشەیەك یان زیاتر لەدوای قافیەکەوە.

لــــە سینەمدا سەدای ناڵینە بێ تۆ
دڵــــی زارم بەسێ غەمگینە بێ تۆ
ئەبەد وەك من غەمیش ساحب وەفایە
رەفیق و هــــەم دەمی دێرینە بێ تۆ[96]

لە شیعری فۆلکلۆری کوردی و شیعری شاعیرانی کەدا کە سەر بەم قوتابخانەیە نین گەلێ جۆری تر لە قافیە دەبینین. بۆ نمونە ئەشێ هەر بەیتێك یان هەر دوو نیوە دێڕی پارچە شیعرێك قافیەیەکی هەبێ و دێڕە شیعرەکانی دیکە هەر یەکە قافیەیەکی سەربەخۆو جیای هەبێ. واتە جووت قافیە. یان قافیەکان (تاکو لۆ) بەکار هاتووە کە لە یەکەم شەترەوە قافیەکان یەکنایەك یا تاکو لۆ دادەنرێن.

ئەگەر بەرهەمی شیعری ئەم قوتابخانەیە بەگشتی و دیوانی شیعری نالی، سالم، کوردی بەتایبەتی سەیر بکەین دەبینین لەرووی قافیەشەوە شێوازێکی یەکگرتوو و چونییەکیان هەیە و تێکڕا هەر سێکیان پێڕەوی یەك شێوەیان کردووە و جۆرە قافیەیەکیان بەکار هێناوە.

---

[96] دیوانی سالم، ل٦٥.

# شێواز لە بەرهەمی شیعری نالی و سالم و کوردی

## سەرەتا :

وەك لە بەشەکانی پێشوودا دیاریمان کرد کە شێواز بەخاسیەت و تایبەتێتی ئیستێتیکی بەرهەمی کۆمەڵە شاعیرێك دەوترێ، ئەوانەی تێڕوانینی وەك یەکی لە ژیاندا کۆیان دەکاتەوە و بەشێوازە یەکگرتووەکەیان ڕێباز و قوتابخانەیەکی شیعریان پێکهێناوە کە بە قوتابخانەی شیعری کلاسیکیی ناوچەی سلێمانی ناسراوە و لەسەردەم و قۆناغێکی دیاریکراودا لەمێژووی ئەدەبی کوردیدا جێیخۆیگرتووە..

لەم بەشەدا مەبەستی لێکۆڵینەوەکەمان دیاریکردنی شێوازی شیعرەکانی ئەو سێ شاعیرەیە : نالی، سالم، کوردی.

بەهۆی ئەوەوە کە هەریەکە لەو شاعیرانە جۆرە شێوازێکی تایبەتی هەیە، ئەشێ دیاریکردن و باسی شێوازیان بەجیاواز بکرێت. چونکە هەندێ لەو رەگەزە شێوازییانەی کە لەلای یەکێکیان دەبینرێت، لەلای ئەوی دیکەیان نییە، یان بەپێچەوانەوە. لەلایەکی تریشەوە هەر شاعیرەو بەپێی توانا و دەسەڵات و زەوق و سەلیقەی خۆی جۆرە شێوازێکی هەڵبژاردووە، یان بۆ دەربڕینی بیرەکانیان و رازاندنەوەی پارچە شیعرەکانیان پەنایان بردۆتە بەر هونەرە رەوانبێژیەکان، بەکار هێنانی ئەم هونەرە رەوانبێژیانە جگە لەوەی بەتوانایی و کارامەیی شاعیر دەردەخات، زۆری بەکارهێنانی لە بەرهەمی شیعریدا دەبێتە شێوازێکی تایبەت و جیاکەرەوەی بەرهەمی خاوەنەکەی.

بێگومان ئەم هونەرانەش بەگشتی روو لە وشە و دەستەواژەکان و جۆری ریز کردن و هەڵبژاردنی وشەکان دەکا، واتە شێواز بەکارهێنانی زمانە لە شیعر یا نووسیندا بۆ دەربڕینی بیرو هەست و سۆز. لێکۆڵەرەوە و شارەزایانی ئەدەب شێوازیان بە رەگەزێکی سەرەکی لە چوار رەگەزەکەی ئەدەب لەقەڵەم داوە کە بریتین لە سۆز، واتا، شێواز، ئەندێشە[1] هەروەها بەپێی رادەی پەیڕەوی کردنی دەستور و رەگەزەکانی شێواز دەڕواننە

---

[1] احمد امین، النقد الادبی، ١-٢، بیروت، ط الرابعە، ١٩٦٧، ص٣٨.

بەرهەمی شاعیر یا نووسەرێك، ڕێك و پێكی و چاکی بەرهەمێك بەتایبەت شیعر لە ڕاست و دروستی بەکارهێنانی ڕەگەزەکانی شێوازەوە دیاری دەکەن.

ئێمە لێرەدا بە کورتی و بەتەنیا ناوی ئەو ڕەگەزانەی شێواز دێنین بەمەبەستی ڕوون کردنەوە و سنور دانان بۆ کارەکەمان، و بەپێویستی دەزانین چونکە تا ئێستا لە ئەدەبی کوردیدا لەم ڕووەوە باسی شێواز نەکراوە جگە لەو هەوڵەی شێخ نوری شێخ ساڵح نەبێ کە بە چەند وتارێك لە ڕۆژنامەی ژیاندا بڵاوی کردۆتەوە[2] لە پاش ئەوەی لەم سەرەتایەدا تەنیا ناوی ڕەگەزەکانی شێواز دێنین لە لێکۆڵینەو و دیاریکردنی شێوازی هەر یەکە لەو سێ شاعیرەدا بەپێی پێویست ئەو ڕەگەزانە ڕوون دەکەینەوە کە لە بەرهەمی شیعری هەر یەکەیاندا هەبێت، بێگومان ئەگەر ڕەگەزەکانی تری شێواز لەلای شاعیران نەبوون ئێمە بەزۆر نایسەپێنین بەسەر شێوازیاندا و باس کردنیشی بە زیا دەزانین هەروەها لێکۆڵینەوەو باسی ڕەگەزێك لەلای شاعیرێك بەپێی زۆری بەکار هێنان و سەرکێشی بەسەر ڕەگەزەکانی تردایە کە بەهۆیەوە شێوازێکی بۆ بەرهەمەکەی دیاریکردووە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو جۆرە هونەرە یا ئەو ڕەگەزە شێوازییە لەلای شاعیرانی دیکە نییە، بەڵکو ئەشێ لەلای هەر سێ شاعیرەکە هەبێت، بەڵام بەزۆری و تایبەتمەندێتی یەکێکیان دەردەخا و لەوانی تر جودای دەکاتەوە.

پارچە شیعرەکان سەرچاوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەبن و نمونەی شیعری کە بەڵگەی بەکارهێنانی شێوزاێکی دیار و ئاشکرا بن دەبنە کەسەرەی لێدوان لەو جۆرە شێوازە نەك بەگشتی و فراوانی باسی هەموو ڕەگەزەکانی شێواز بگرێتەوە وەك لەوەو بەر ڕوونمان کردەوە.

بەگشتی شێواز لەرووی سێ ڕەگەزی سەرەکیەوە شیدەکرێتەوە و دیاری دەکرێ ئەویش ئەمانەن :

---

[2] م.نوری، شێواز چییە، ڕۆژنامەی ژیان لە ژمارە ٣٩ی ٢٨ تشرین الاول ١٩٢٦ تا ژمارە ٥٩ی ٢٤مارت ١٩٢٧. (لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەپێی پێویست باسی ئەم وتارانەم کردووە).

**یەکەم /ڕەگەزە بیرییەکان (العناصر الفکریە)**

هەندێ سەرچاوە بە تایبەتیە گشتیەکانی شێوازی ناو دەبەن، بەڵام لە دابەشکردنی ڕەگەزەکانیدا یەکدگیر دەبن[3]، ڕەگەزە بیرییەکانیش بریتین لەمانە :

١. ڕاستێتی ٢. ڕوونی ٣. وردی (بیر وردی)

**دووەم /ڕەگەزە سۆزییەکان (العناصر العاطفیة)**

١. هێز ٢.تازەگەری (نوێییەتی) الجدە ٣. کارلێکردن و خورپە (الایحاء).

**سێیەم /ڕەگەزە جوانکارییەکان**

١. مۆسیقا ٢.کۆك و نایابی(الروعە) ٣. ئەفسون.

ئەم سێ ڕەگەزە جوانکاریانە شێوازیان پێ جوان و شیرین دەبێ.

ڕەوانبێژیەکان لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکانیاندا سەبارەت بە ڕەگەز و لایەنەکانی شێواز تەنیا لە ڕووی ڕاست و دروستی و جوانی و ڕادەی پێڕەوی کردنی ئەو ڕەگەزانە لە بەرهەمی شیعرێکدا دەدوێن و ناتەواوی خەوشەکانی دیاری دەکەن. هەرچی لێکۆڵەرەوەی ئەدەبە گرنگی دەدا بە دەرخستن و دیاریکردنی پێوەندی نێوان تایبەتی و سیفاتەکانی ئەو ڕەگەزانە و لایەنە دیار و ئاشکراکانی بیر و سۆز و جوانکاری نووسین، یا پارچە شیعرەکە کە سەرجەم دەبنە شێوازێك کەسایەتی و تایبەتمەندێتی خاوەنەکەی دیار دەخەن.

## شێوازی شیعری نالی

بەهۆی ئەوەوە کە بەرهەمە شیعرەکانی نالی یەکجار شاکارن و ڕەنگدانەوەی پلەیەکی مێژوویی گرنگە لە ئەدەبی کلاسیکیی کوردیدا، بۆیە دەبینین زۆربەی ئەو نووسەر و توێژەرەوانەی مێژووی ئەدەبی کوردی کاتێ کە لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی شیعرەکانی نالیان کردووە، لە زۆر ڕووەوە لە نالی و شیعرەکانی دواون، ئەگەر بە کورتی و بەهێمایەکیش بووبێ لایەنی شێوازیان فەرامۆش نەکردووە. ئەگەرچی هەندێ

---

[3] الدکتور محمد غنیمی هلال، النقد الادبی الحدیث، بیروت، ١٩٧٣، ص١١٨، شێخ نوری بە مزیاتی عمومی ناویان دەبا، بڕوانە، ژیان، ژمارە ٤٣، ٢٥ ت٢ ١٩٢٦.

لەو سەرچاوانە راستەوخۆ ناوی شێوازیان نەبردبێ یان شێواز بەو چەمکەی کە ئێستا زیاتر روون بۆتەوەو واتاو ماناکەی دیارە، لای ئەوان کەمتر یان بەتەواوی مەبەستی شێوازیان نەداوە بە دەستەوە، بەڵام ناوەڕۆکی نووسینەکانیان مەبەستی شێواز و دیاریکردنی شێوازی نالی بووە.

ئەمین فەیزی لەم رووەوە دەڵێ: زەکای نالی ئینکاری ناکرێ، لاکین ئەوەندە سەنایعی لەفزییەی ئیستیعمال کردووە پیاو رەنگە بڵێ شیعری ئەو نەتیجەی عیلم و ئیشتیغالە[4] هەروەها شێخ نوری لە دیاری کردن و جیاکردنەوەی شێوازی شاعیراندا دەڵێ ((نالی بە دەقیقی ئەفکار و جناس و نکتە سنجی ئەوەدە مەعروفە ئەو کەسەی مەراقی شیعر و ئەدەبیاتی هەبێ و تەتبعاتی شیعری کردبێ و ئوسلوبی تەدقیق کردبێ هەر بە خوێندنەوەی شیعری ئەم ئەدیبە دەست بەجێ ئەناسێ))[5]. پیرەمێرد لەو وتارەیدا کە لە ژێر سەرباسی ((خدمەتێکی بێ هەمتا بە موناسەبەتی تەبعی دیوانی نالیەوە)) لە رۆژنامەی ژیاندا بڵاوی کردۆتەوە، شێوازی شیعرەکانی نالی بەم شێوەیە دیاری دەکا ((ساحیبی ئوسلووبێکی تەننانە، شیعرەکانی خۆش ئاهەنگ و رەوانە، وە لە ئەکسەری مەنظوومەکانیدا فکری ورد (تەشبیهاتی خۆ_کرد) و خەیاڵی بڵند بە تەرزێکی رەنگین و ئاودار ئەدا کردووە))[6]. عەلادین سەجادی لە رێگای شیکردنەوەو لێکدانەوەی چەند نمونەیەکی شیعری نالیەوە، ئەوە دەردەخا کە نالی زۆر بەتوانا بووە لە هونەرە رەوانبێژیەکاندا و لە شیعرەکانیدا جوانکاری و رەگەزدۆزی و وردەکاری زۆری بەکارهێناوە[7].مەسعود محەمەد لە چەپکێك لە گوڵزاری نالیدا لە شیکردنەوە و لێکدانەوەی دێڕە شیعرەکاندا بە زۆری روو لە وشە و رستەو هەڵبژاردنی وشەکان دەکا،و هەر لە رێگای وشەکانیشەوە واتا جۆراو جۆرەکان دیاری دەکات، وەك لەوەوبەر وتمان ئەمیش راستەوخۆ باسی شێوازی نالی نەکردووە بەڵام لە توێژینەوەو وەسفکردنی شیعرەکاندا شێوازی نالی روون کردۆتەوە. بۆنمونە لە چەند شوێنێکدا دەڵێ ((لەم

---

[4] ئەمین فەیزی بەگ، ئەنجومەنی ئەدەبیات، بەغدا، ١٩٨٣، ص٢٧-٢٨.

[5] رۆژنامەی ژیان، ژ٤٠، ٤ی تشرینی دووەم، ١٩٢٦.

[6] سەرچاوەی پێشوو، ژمارە(٢٩٣)، ١٤ ئەیلولی ١٩٣١.

[7] عەلائەددین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٧١، ل٢٤٨-٢٥١.

نمونانەدا وشە و قالّبی شیعرەکان هێندە شلك و ناسکن . . . هتد)) یان (( وێنەکانی نالی دێنێتە بەر چاو کە بریتیە لە سەر نەرم کردنی وشە و واتای سەخت بۆ ناو قالّبی هەلّبەست))[8]. د.مارف خەزنەدار بەگشتی باسی شێواز دەکا و لەروون کردنەوەی واتای شێوازەوە ئەوە پیشان دەدا کە شیعری نالی بەهۆی شێوازەوە دەناسرێتەوە و دەلّێ ((بێگومان یەکێك لە رەمزەکانی بلیمەتی ئوسلووبە ئەمە شێوەی دەربڕینی بیر و گرتنی وێنەیە شاعیری بلیمەت لە قالّبێکی تایبتیدا دەری دەبڕێ، ئەوەی لەو ئوسلووبە بگا بە ئاسانی دەتوانێ دەست لەسەر هەموو ئەو شیعرانە دابنێ کەدەکەونە دەرەوەی ئوسلووبی نالیەوە))[9].

لە دیوانی نالیدا جگە لەوەی لە لێکدانەوەو شیکردنەوەی دێرە شیعرەکاندا، زۆربەی هونەرە رەوانبێژییەکان لەلای نالی دیاریکراون، لە هەندێ لاپەڕەی پێشەکیەکەدا ئیشارەت بە شێوازی تایبەتی نالی کراوە. لە باسی زاراوە رەوانبێژیەکاندا دەلّێ (( زیرەکی و بلیمەتیەکەشی پالّی پێوە ناوە هەرچی جوانکاری و وشە ئارایی هەیە بەکاری بێنێ. لەبەر ئەوە شیعرەکانی بێجگە لە قولّیی مەعناو ناسکی هێما پڕیشن لە (موحەسیناتی بەدیعی)))[10] .

ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە کە ئەو نووسینانەی لەوەوبەر هێنامان بەگشتی هەموویان لە شێوازی نالیدا چەند رەگەز و تایبەتیەکیان دەستنیشان کردووە، لە ئەنجامدا دەتوانین پوختەی باسەکانیان سەبارەت بە شێوازی نالی لەم چەند خالّەدا دیاری بکەین :

**١. بیر وردی.**

**٢. بەکارهێنانی هونەرە رەوانبێژیەکان بە تایبەت رەگەزدۆزی و حوسن تەعلیل.**

**٣. نوکتە سەنجی، زیرەکی و بەتوانایی لە هەلّبژاردنی وشەو زاراوەکاندا و جوانی و رازاندنەوەی پارچی شیعرەکان.**

---

[8] مەسعوود محمد، چەپکێك لە گولّزاری نالی، بەغدا، ١٩٧٦، ل١١٨.

[9] د.مارف خەزنەدار، چەند پەراوێزێکی دیوانی نا لی، رۆژمانەی کوردستان، ژمارە ٣٤. ل٤١.

[10] دیوانی نالی، لێکۆلّینەوە و لێکدانەوە، مەلا عبدالکریمی مدرس و فتاح عبدالکریم، بەغدا، ١٩٧٦، ل١٥.

وەك وتمان پارچە شیعرەکان باشترین سەرچاوەن بۆ ئەم باسە، دەبینین نالی خۆی لە چەند لایەکی دیوانەکەیدا بە چەند پارچە و دێڕە شیعرێك شێوازی خۆی دیاریکردووە و دەڵێ :

بـلـبـلـی تـەبعم ئەوا دیسان سـەناخـوانی دەکا
نوکتە سەنجی و بەزلەگۆیی و گەوهەر ئەفشانی دەکا

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

نووکی خامـەی من کە بێتە مەعنی ئارایی کەمال
خەت بە خەت ئیزهاری نەقشی سوورەتی مانی دەکا

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردی یە خۆ کردیە
هەرکەسێ نادات نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکا

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

شیعری خەلقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ ناسکی
کەی لە دیققەت دا پەتك دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

نالی لە شێوازە دەستکردە سەرکەوتووەکەیدا بەتەواوی رەگەزە بیریەکانی لە شیعرەکانیدا دیاریکردووە لەو رەگەزانەی کە دەبنە شێوازێکی چاك و سەرکەوتوو سەرەتا باس لە دروستی (الصحه)وە دەکەین، رەگەزی دروستمەندی زیاتر روو لە وشە و زاراوەکان و لایەنە رێزمانییەکان دەکات. سەرکەوتوویی و زمان پاراووی شاعیر لە راست و دروستی بەکار هێنانی وشە و دانە رێزمانییەکاندایە. بنچینەی رێك و پێکی و چاکی وتەکان دروستمەندی شێوازە. ئەم دروستمەندییەش پێویستی بە ئەنجام گەیاندنی چەند ئەرکێکی رێزمانییەوەیە لەوانە راستی بەکارهێنانی ئەو وشانە کە وتە و ماناکان دەبەستن بەیەکەوە[11]. لەو وشانەش ناو و کار ئەرکی سەرەکی دەبینن. ئەو وشانەی کە لە ناوەوە وەردەگیرێ دەبێ ئەو ناوە بۆ شتێ بەکار ببرێ کە پڕاوپڕ واتاو مەبەستی ئەو شتە بدات. ئەو وشانەی لە کارەوە وەردەگیرێن و گەردان دەکرێن نابێ بەشێوەیەك پاش

---

[11] النقد الادبی الحدیث، ص١١٨.

و پێش بخرێن یان جودا بکرێنەوە کە واتاکە بشێوێنێ. ئەگەر مەبەستی شاعیر پێچ هەڵپێچ و مەتەڵ نەبێ کە هەندێ جاریش بە (گرێ لێدانی واژەیی) ناو دەبرێ[12]. یان بەهۆی پارسەنگی و بە ئەنجام گەیاندنی لایەنە هونەرییەکانی شیعرەوە دروست دەبێ وەك کێش و قافیە. ئەم رەگەزە لە شێوازی نالیدا زۆر بە روون و ئاشکرا دیارە و دەتوانین بڵێین نالی لە سەرانسەری قەسیدەو غەزەل و پارچە شیعرەکانیدا هەڵەو لادانی رێزمانی ئەوەندەی تیا بەدی ناکرێ، بەڵکو وشەکانو بەشەکانی وتەکانی بەپێی رێزمان و دەستوری زمانی کوردی داناوە و ئەم رەگەزەی فەرامۆش نەکردووە، ئەگەر هەندێ هەڵەی دەستکرد و هەناسەسواری لێبەدەرکەین کە جار جارە بەهۆی پارسەنگی قافیە یا بە دەستووری ( ئەوەی بۆ شاعیر دەست دەدات بۆ خەڵکی تر دەست نادات) جار جار ئەم رەگەزەی بەمەبەستی کارێکی نوێ و داهێنان کردبێ بۆ نمونە وشەی (قیامەت)ی کردووە بە (قیا)، (لام وایە یەکێکیش بچێتە ناو کۆت و پێوەندی یاسای شیعری عەرەبیەوە دروستە ئەو لادانە بکا و ناشبێت بە خەوش[13].

مەحخەرە هاوی یەی هـــەوڵی فیراق

دەستی من دامەنی تۆ رۆژی قیـــــا

لادانی نالی لە رەگەزی راستێتی دەمانبا بۆ رەگەزێکی تری شێواز کە ئەویش رەگەزی (تازەگەری) یا نوێیەتیە کە یەکێکە لە رەگەزە سۆزییەکان. شاعیری مەزن و بەرهەمی گەورە لەم رووەوە داهێنان دەکەن بەشێوازێك و دەیسەلمێنن کە بۆ خەڵکی تر ناشێ و سەرناگرێ، ئەم رەگەزە لێرەدا لە وشە و دیاردەی نوێکاری لەلای نالی دەبینرێ کە لەوەوبەر باو نەبووە، نالی داهێنانی تێدا کردوە و بۆتە باو بۆ نمونە ئەم چەند وشانە کە تایبەتن بە نالیەوە : دیدەباز، بۆ چاوباز، روونەبوون، بەرامبەر روونەهاتن و شەرمەزاری، کوژابێ، کوژرابێ، دا، تا، با. واوەی لەبری واوەیلا. سەوزە درەخت، بۆ درەختی سەوز. شەوی قەدر، بۆ (لیلە القدر) لەیلەتولقەدەر کە ئەم وشەیە عەرەبییەو لە وشە ئاینییەکانە کە کورد هەر بەو شێوەی خۆی بەکاری دەهێنێ بەڵام نالی بەشی

[12] النقد الادبی الحدیث، ص ١١٩.

[13] رۆوف عثمان، ((دیوانی نالی پیاچوونەوەیەك))، رۆشنبیری نوێ، ٦٠، نیسان و مایسی ١٩٧٧، ل٩.

یەکەمی ئەم وشە لێکدراوەی کردووە بە کوردی و بەشی دووەمی هەر بە عەرەبی ماوەتەوە. دووچەندن ، دوو ئەوەندە و دیاردەی تریش لەم رووەوە.

## بیروردی

ئەم رەگەزە بەتەواوی باڵی بەسەر شیعرەکانی نالیدا کێشاوە. لە هەموو دێڕە شیعرێکدا وردەکاری و بیر وردی نالی بەدی دەکرێ، بێگومان پارچە و غەزەل و قەسیدەی نییە ئەم شێوازەی نالی پێوە دیار نەبێ.

بیر وردی یەکێکە لە رەگەز و تایبەتیە گشتیەکانی شێواز بەڵام خەست بوونەوەو چڕی بەکارهێنانی ئەم رەگەزە بە هەموو شاعیر و نووسەرێك ناکرێ، شاعیری خاوەن دەسەڵات و کارامە و رەوشت بەرز و بیر ورد دەبێ شێوازی دەربڕینیش وردو بەرز بێت، چونکە شێواز ئاوێنەی خاوەنەکەیەتی. شاعیری بەتوانا لەگەڵ رەگەزی راستێتی و زمان پاراویەکەیدا ئەم رەگەزەش فەرامۆش ناکات، لە دەربڕینەکانیدا وشەی پڕ واتا و گونجاو و لەبار هەڵدەبژێرێ و مەبەست و بیرە وردەکانی لە قاڵبی وشە و داڕشتنێکی راستدا دادەڕێژرێ. شێواز وردیی ئەوەیە کە شاعیر دوورکەوێتەوە لە وشەی سوواو زۆر وتراو هەروەها زمانی شیعر پێویستە بێ بەری بێ لە زیادە رۆیی و جوینەوەو ریزکردنی وشەی زۆری بێ بەهانە[14]، لەبەر ئەمە شاعیری ورد دەبێ هونەرەکەی شاراوە بێت، بەشێوەیەك هەست بەوە بکرێ کە بەبێ زۆر لەخۆ کردن بە سروشتی و ئاسایی دەدوێ و هیچ دروستکراوو زۆر لە خۆ کردنی تیا بەدی ناکرێ.

ئەم بیر وردیە لەلای نالی وەك لەوەو بەر وتمان لە گەلێ پارچە شیعر و قەسیدەکانیدا بەدی دەکرێ ونالی خۆی ئەم شێوازەی چەند جارێك بە دێڕە شیعرێ بۆ دیاری کردووین بەتایبەت لەو دوو پارچە شیعرەیدا زۆر بە روونی شێوازە تایبەتی و سەرەکیەکانی خۆی دیاری کردووە

پارچەی یەکەم: کە بەم سەردێڕەیە

تەبعی شەککەر باری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا

[14] النقد الادبی الحدیث، ص١٢٠.

پارچەی دووەم :

بلبلی تەبعم ئەوا دیسان سـەناخوانی دەکا

نالی لەگەڵ بەتوانایی و دەوڵەمەندی لە وشە و زاراوەکاندا زۆر جار بۆ مەبەستی بەدیهێنانی ئەم ڕەگەزە گەلێ وشەی لە بێژنگ داوە و هەروەها تووشی گێژی و سەرەسوڕەش هاتووە تا وشەی وردو پڕی لە پۆخڵەو پل و پوش جیا کردۆتەوە :

دەورانییە وەك هێڵەکی سەودا سەری گێژم
بـۆیە بە دەقیقی مەسەلە هـەرچی دەبێژم

دیاردەیەکی گومان لێ نەکراوە شاعیرێکی وەکو نالی لەگەڵ ئەوەشدا کە موبالەغە و شانازی بەخۆی و شیعرەکانییەوە کردووە، بەڵام هەرگیز ئەمە وای لێنەکردووە کە حەقیقەت بشێوێنێ و خۆیەتی پاڵ پێوەنەناوە کە بەرهەمی خۆی ئەگەر شایەنی ئەوە نەبووبێ بەو جۆرە وەسفی بکات یا بەرهەمی خەڵکی دیکە لە هی خۆی بە کەمتر بزانێ. بۆیە بەلای ئێمەوە ئەم دێڕە شیعرەی نالی ئەگەر هەر واتاو لێکدانەوەیەکی تریش هەڵبگرێ، نالی لێرەدا زیاتر ئەوەی مەبەست بووە کە ڕەگەزی ورد و ناسکی شێوازەکە دەربخات و بەوشێوازە لە شیعری شاعیرانی تر جودا بکرێتەوە :

شیعری خەڵکی کەی دەگاتە شیعری من بۆ ناسکی
کەی لە دیقەت دا پەتك دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا

هەر لەو پارچە شیعرەدا جگە لە بیر وردی، نالی بە تێر و تەسەلی لایەنەکانی تری شێوازی خۆی دیاریکردووە لە بەکارهێنانی هونەرە ڕەوانبێژیەکاندا وەك لێکچواندن و ڕەگەزدۆزی و حوسنی تەعلیل. هەڵبژاردنی وشەی لەبارو پڕ واتا و بەتوانایی و وردی لە بەکارهێنانی وشە و زاراوەی زمانەکانی دیکەشدا. جا بۆیە ئەم پارچە شیعرە دەبێتە تەوەرو سەرچاوەی گەلێ بابەتی لێکۆڵینەوە بەتایبەت لە دیارکردن و دەرخستنی شێوازی نالیدا.

وشە چالاکی گیانە و ئامرازێکە بەهۆیەوە تیشکی ڕووناکی بیر و هەست دەردەخا و ڕوونی دەکاتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا تەنیا وشە چست و چالاکی گیان نییە و پێچەوانەی ئەمەش ڕاستە واتە چالاکی گیان زاتی وشە خۆیەتی[15]، لەبەر ئەمە وشە دەتوانێ ڕوو

[15] أ.ف. تشيتشرين، الافكار و الاسلوب، ترجمه د.حياه شراره، بغداد، ص٤٣.

لە گەلێ واتا و مەبەست بکات هەروەها دەتوانێ رووەو تاکە کەسێ یا کۆمەڵێ مرۆڤ بێت یا سەرانسەری گێتی ئاگادار بکا، بۆیە نالی لە چامە بەناوبانگەکەیدا کە نامەیە بۆ سالمی هاورێی، هەمیشە ئەندێشەو بیرەکانی لە تەك بەسەرهات و حاڵی خەڵکی ناوچەکەدا لەبارەی کۆمەڵایتی و سایکۆلۆجیەوە تێکەڵ بە چالاکی ناوەوەی وشەکان دەکا و مەبەستی رواڵەتی وشەکان دەبەستێ بەلایەنەکانی تری ناوەوەی وشەکانەوە بۆیە (وشە غەمی ئەوە دەخوا کە بیر روون بکاتەوە تەنانەت ئەو وشانەش کە هێمان بۆ بیرێکی کپ روو بەرووی مرۆڤ دەبنەوە)[16]. هەر لەبەر ئەو خاسیەت و تایبەتیانەی وشەیە کە نالی بەشێوازێکی ورد و بەهێز لە چەند وشەیەکی کەمدا مانا و واتایەکی زۆر دەدا بە دەستەوە :

شەونم کە نەزم و نەسرە لە ئەوراقی غونچەدا

گۆیا بووە بەزار و زمـــــان و ددان و پووك

(نالی) عەجەب بە قووتـــی حیکمەت ئەدا دەکا

مەعنای زۆر و گەورە بە لـــە فزی کەم و بچوك

دارشتنی ورد و کورتبڕی شێوازێکی دیکەی سەرکەوتوانە و دیارە کە نالی لە نامەکەیدا بە وردی پەیڕەوی کردووە، بۆ هێنانە دی ئەم رەگەزەش رووی لە هونەرە رەوانبێژیەکان کردووە وەك خوازەو لێکچواندن و رەگەدۆزی.

شارێکە پڕ لە عەدل و لە جێگەیێکی خۆش و نەرم

بـــــــۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن شـــــاری شارەزوور

* * * * * * * * * * *

ئـــــەهلی وای هەیە کە هەموو ئەهلی دانشن

هـــــەم نازیمی عوقوودن و هەم نازیری ئوموور

* * * * * * * * * * *

ئێستەش پڕە لـــــە ئاهوویی بەرِ کانی ئاسکان

یـــا خو بووە بە مەلعەبەی گورگ و لوورە لوور؟

---

[16] أنف. تشيتشرين، الافكار و الاسلوب، ترجمه د.حياه شراره، بغداد، ص ٤٣.

ئێستەش کەناری حەوزەکە جێی باز و کەوشەکە
یــــــاری تێدایە یــا بووەتە مەعرەزی نوفوور؟

لێرەوە لە شێوازی هونەری نالیدا وەك زۆربەی شاعیرانی قوتابخانەی کلاسیکی و کاریگەری ئەدەب و لایەنە هونەریەکانی شیعری ستوونی گەلێ هونەری رەوانبێژی لە بەرهەمی شیعری نالیدا بەدی دەکرێ وەك خوازە و خواستن و درکەو . . . . هتد بەڵام ئەوەی کە بە زۆری نالی گرنگی پێداوە و بۆتە شێوازێك و تایبەتێتی نالی دەردەخا وەك لەوەوبەر وتمان رەگەزدۆزی و حوسنی تەعلیل و لێکچواندنە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەپێی پێویست باسی جۆرەکانی رەگەزدۆزی بە نمونەوە لە شیعرەکانی نالیدا دەکەین لە پاشا لە حوسنی تەعلیل و بە کورتیش لە لێکچواندن دەدوێین.

بە هۆی گرنگی زانستی رەوانبێژیەوە کە لەلای زۆربەی نووسەرانی ئەدەب جێگیر بووەگەلێ ناو و زاراوەی جۆراوجۆر بۆ ئەم زانستە بەکارهێنراوە. هەیە بەم زانستە دەڵێ (هونەری قسە کردن) هەندێکی تر بە (هونەری دانایی ئەدەبی) یان (هونەری دارشتن) یان (هونەری شێوازەکان) یان (هونەری شێوە ئەدەبیەکان) ناوی دەبەن . زۆری ئەم زاراوانە دەگەرێتەوە بۆ پەرت و بڵاوی و هەمەلاینی زانستی رەوانبێژی[17]. جیاوازی زاراوەکان گرنگ نییە بەقەدەر ئەو گۆران و گەشە کردنەی کە بەسەر بەرنامەکانی لێکۆڵینەوەکاندا دێ لە رووی نوێگەری و نایابی بەرهەمە تازەکانەوە. هەر لەم روانگەیەوە دەبینین بابەتی شێواز تەنانەت بەشێوەی (ناویش) لە کتێبی (البیان و التبین)ی جاحزدا بەهیچ جۆرێ ناوی نەهاتووە، بەڵام کۆمەڵێ زاراوەی تر بەکار هاتووە کە کەرەسەێکی خاون و لەگەڵ روونبوونەوەی زانستی رەوانبێژیدا بەگشتی ئەوانیش دەردەکەون و روون دەبنەوە[18].

تەوەرێکی دەلالی رەوانبێژی بریتیە لە هێنانە دی هونەرێك کە بەهۆیەوە تایبەتی و خاسیەتێك دەدا بە وتە و بێژەکان کە ئەرك و ئامانجی زمانەوانی فراوانتر دەکەن، بە جۆرێك دەیگۆرێ لە نەنیا کاری گەیاندن و گفتوگۆوە دەیکا بە کەرەسەیەکی پێکهێنان

[17] د. احمد مطلوب، البحث البلاغی عند العرب، الموسوعة الصغیرة، ع١١٦، بغداد، ١٩٨٢، ص٩.

[18] عبدالسلام مسدی، المقایس الاسلوبیة فی النقد الادبی من خلال ((البیان و التبین)) للجاحظ، حولیات الجامعة التونسیة، العدد١٣، العام ١٩٧٦، ص١٤٨.

دروست کردنی هونەری چ لە پەخشانا بێت یا لە شیعردا کە جاحز بە چەمکی (پیشەیی) ناوی دەبا[19].

بەکارهێنانی ئەم هونەرە رەوانبێژیانە لە شیعرەکانی نالیدا بەتەواوی ئەو شێوازەیان دیاری کردووە ئەویش بەوەی کە زمان لە شیعرەکاندا جگە لەو ئەرکەی کە راگەیاندن و خەبەردانە گەلێ مەبەست و ئامانجی تری هەیە. بەهۆی هەڵبژاردنی وشە و مامەڵە کردنی لەگەڵ وشە و دەربڕینەکاندا توانیویەتی بەرزترین و شاکارترین بەرهەمی شیعری بەهێز و پڕ لە هونەری رەوانبێژی بەتایبەت رەگەزدۆزی بە ئەنجام بێنێ .

## لێکچواندن

هونەرێکە لەو هونەرانەی سەر بەبەشی رەوانبێژیە لە رەوانبێژیدا. عەلائەددین سەجادی زاراوەی (وەك یەك)ی بەکار هێناوە[20]. ئەم هونەرە سادە و ئاسان نییە شاعیر بەتوانا نەبێت سەرکەوتوو نابێ لە بەکارهێنانیدا. هونەرێکی ئاوێتە و تێك دارژاوە بەهۆی چەند بنەڕەت و رەگەزێکەوە دروس دەبێ[21]، ئەو رەگەزانەش ئەمانەن :

١. **(لێکچوو – المشبه)**

٢. **لەوچوو – المشبه به**

٣. **لێکچوون – وجه التشبه**

٤. **ئەوزار وشەیەکە سیفەت و پێوەندی هەردوولا واتە لێ چوو لەو چوو بەیەکەوە بەند دەکا.** لە شیعری نالیدا ئەم هونەرە بەچەند شێوازێك دەبینرێت وادەبێ هەر چوار رەگەزەکە لە دێرە شیعرێکدا هەبێ. هەروەها زۆرجار لێکچوون بەتەنیا لە لێکچوو و لەوچوو دروست دەبێ ئەمە بەتوانایی شاعیر دەردەخا جگە لەوەی کە لەم جۆرەیاندا کورتبڕی و وردی شێوازی شاعیر پیشان دەدا.

---

[19] عبدالسلام مسدی، المقایس الاسلوبیة فی النقد الادبی من خلال ((البیان و التبین)) للجاحظ، حولیات الجامعة التونسیة، العدد١٣، العام ١٩٧٦، ص ١٥٠.

[20] عەلائەددین سجادی، خۆشخوانی، گوزارەکاری، رەوانکاری، جوانکاری، بەغدا، ١٩٧٨، ل٤٤.

[21] عەزیز گەردی، رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی یەکەم، روونبێژی، بەغدا، ١٩٧٢، ل٢٤.

دەفـــەرمو دڵ وەکو ئاوێنە سافە

بڵێ بەم ئاوێنە بۆ بووی بە خود بین

دڵ = لێکچوو، ئاوێنە = لەوچوو، وەکو = ئەوزار. ساف و پاکی = لێکچوون.

لەبت میم و قەدت ئەلفو زوڵم جیم

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| لەب | = | لێکچوو | میم | = | لەوچوو |
| قەد | = | لێکچوو | ئەلف | = | لەوچوو |
| زوڵف | = | لێکچوو | جیم | = | لەوچوو |

لە رەوانبێژی عەرەبیدا لێکچواندن بە گەلێ شێوەو جۆری جیاواز دابەش کراوە شاعیرانی کوردیش بەتایبەت شاعیرانی ئەم قوتابخانەیە ئەم بابەتەشیان وەك هەموو بابەتە رەوانبێژیەکانی ترلە شیعرەکانیاندا کەم تا زۆر بەکار هێناوە، لەم لایەنەشەوە تایبەتی و سروشتی شاعیران و خاسیەتی زمانی کوردی و دەوروبەری ژیانی ئەو شاعیرانە جۆرە تایبەتیەك و خاسیەتێکی جیاوازی تیا بەدی دەکرێ.

## رەگەزدۆزی

ئەم هونەرە شێوازێکی سەرەکی شیعرەکانی نالییە. ئەگەر بەوردی چاوێك بگێڕین بە سەرانسەری دیوانی نالیدا غەزەل و قەسیدەیەکی تیا بەدی ناکەین ئەم هونەرەی تیا نەبێ، ئەگەر لە دێڕە شیعرێکدا نەبوو بێگومان لە چەند دێڕێکی تری ئەو پارچە شیعرەدا رەگەزدۆزیەکە خۆی دەردەخا. وەك لەوەوەبر وتمان بەگشتی شێوازێکی ئەم قوتابخانە شیعریە ئەوەیە پەیڕەوی یاسا و دەستوری شیعری عەموودی عەرەبییان کردووە، سەرچاوەی ئەو هونەرانەش کە لە بەرهەمە شیعریەکاندا بەکار هاتوون رەوانبێژی ئەدەبی عەرەبیە. رەگەزدۆزی لە ئەدەبی عەرەبیدا یەکێکە لەو هونەرانەی کە سەر بەبەشی جوانکارین لە رەوانبێژیدا. مەبەست لە رەگەزدۆزی ئەوەیە کە لە رستەیەکدا یا لە دێڕە شیعرێکدا دوو وشە یا زیاتری تیا بێ و ئەم وشانە لە رواڵەت و شێوەدا لە یەك بچن، واتە وەك یەك بن لە رووی ژمارەی دەنگەکان و ریزکردنیان و شێوەی رێنووسی تیپەکانەوە، بەڵام هەریەکەیان واتای تایبەتی خۆی هەبێ. بەم جۆرە رەگەزدۆزیەی کە لەسەرتاوە باسمان کرد دەڵێین رەگەزدۆزی تەواو. لێکۆڵەرەوە و

نووسەرانی لە مەڕ ئەم بابەتەوە گەلێ جۆرو بەشیان دیاری کردووە، کارەکانیان تایبەتە بە رەوانبێژی و لێدوانی تێروپڕی ئەم جۆرە هونەرانە[22]، ئێمە لێرەدا بەزیادی دەزانین درێژە بەم لێدوانە بدەین و تەنیا باسکردنی هەندێ لەو جۆرە سەرەکیانە کە بە ئاشکرا لە شێوازی نالیدا بەدی دەکرێن بەسە بۆ روونکردنەوەی ئەو مەبەستە :نمونە بۆ رەگەزدۆزی تەواو :

وەرە نێو بــــەزمی گــولزاران و گــولزاران تەماشاکە

هەموو سەرخۆش و مەست و رۆژ پەرست و عاشقی رووتن

ئەرکی وشە و شوێنی لە رستە سازیدا دەبێتە هۆی جیاوازی لە رێنووسدا، ئەگەر دوو وشە لە رستەیەکدا یا لە دێڕە شیعرێکدا لە دیمەن و روالەتدا چوون یەك بوون، بەلام یەکێکیان لە شوێنی ناودا و ئەویی دیکەیان شوێنی ئاوەلناوی لە رستەکەدا گرتبۆوە ئەوا رێنووسەکەیان جودا دەبێ. ئەم جۆرە رەگەزدۆزیە دەوترێ رەگەزدۆزی جیا :

جەنانی وەك جینان کردم بە مەئوا

حـــەبیبەی مالیاوا مالی ئاوا

وا دەبێ یەکێ لە دوو وشەکە لە رووی پێکهاتنییەوە سادەبێ ئەوەکەی تر نا سادە (لێکدراو) بێت، بەم جۆرەش دەوترێ رەگەزدۆزی ئاوێتە یان لێکدراو :

رەقیب و موودەعی وەك پووش و پووشوون

بســـوتێنن کە وەك بەرقین لە بەر قین

رەگەزدۆزی ناتەواویش چەند جۆرێکی هەیە. ئەم رەگەزدۆزیە بەهۆی زیاد و کەمی دەنگەکانی وشەکانەوە دەبێ[23]. بەوە دەلێین کە یەکێ لەو دوو وشەیە دەنگێکی لەوی تریان زیاتر بێ. جا ئەو زیادەیە لەسەرەتاوە بێ یا لە ناوەراست یا لە کۆتایی وشەکەدا بێ، وەك پووش و پووشوون لەو دێڕە شیعرەی سەرەوەدا.

---

[22] عەزیز گەردی، رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی دووەم، جوانکاری، هەولێر، ١٩٧٥، ل٧-٢٦، علاوالدین سجادی، خۆشخوانی، گوزارەکاری، رەانکاری، جوانکاری، بەغدا، ١٩٧٨، ل١٢٦.

[23] هەندێ سەرچاوە بەهۆی کەمی وشەیەکیانەوە بە رەگەزدۆزی ناتەواو(ناقص) ناوی دەبەن وەك عەلائەددین سجادی، بڕوانە: خۆشخوانی، ل١٢٩، هەندێك بەهۆی زیادی دەنگەکانی وشەیەکیانەوە بە (رەگەزدۆزی زیاد) ناوی دەبەن وەك عەزیز گەردی دەلێ بڕوانە، رەوانبێژی ، بەرگی دووەم، ل١٦.

لە زمانی عەرەبیدا سەرو بۆرو ژێر (فتحە و ضمە و کسرە) جێگای پیتە بزوێن دەگرن. لە هەندێ وشەدا کە ژمارەی پیتەکان وەك یەکە ئەم (جووڵانە) دەبنە هۆی جیاوازی واتا. بەکار هێنانی ئەم جۆرە وشانە لە رەوانبێژی عەرەبیدا بە رەگەزدۆزی مەحەرەف ناودبرێ، عەلائەدین سەجادی بە (لادەر) ناوی دەبا[24]. بەڵام بەڵگە نەویستە کە لە زمانی کوردیدا ئەو جوڵانەش هەر وەکو دەنگەکانی تری زمانی کوردی دەنگن و لە رێنووسدا نیشانە و تیپی تایبەتیان هەیە، لەبەر ئەمە ئەم رەگەزدۆزیە لە زمانی کوردیدا ئەشێ هەنێکی بە رەگەزدۆزی ناتەواو دابنرێ چونکە زیادی دەنگێك لە وشەیەکیاندا دەبێتە هۆی گۆڕانی واتاکەی. هەرچی ئەو وشانەشە کە لە دەنگە نەبزوێنەکانیاندا جیاوازن دەچنە ژێر رەگەزدۆزی شوێنکەوتوو (لاحق)ەوە.

**نمونە بۆ جۆری یەکەم :**

کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردیە خۆ کردی یە
هەر کەسێ نادات نەبێ خۆی تالیبی مانا دەکا

لەو دوو وشەیەدا بە رێنووسی کوردی تیپە بزوێنێکی زیادە لەوی دیکە کە بە رێنووسی عەرەبی بە (ضمە) دەنووسرێ.

یان لەم دوو وشەیەدا کە (خزان و خەزان) :

شێخم وەرە دەر فەسڵی بەهار و گوڵ و گەشتە
ئـــەییامی لە گەرما بە خزان فەسڵی خەزانە

**نمونە بۆ جۆری دووەم :**

کـــــە تۆ قیبلەی دەمت سا بێنە قوربان
لـــــــە بۆ قویلە دڵم مەشکێنە قوربان

لەو دوو وشەیەدا کە رەگەزدۆزیەکەیان دروست کردووە بە رێنووسی کوردی دووەم تیپیان لە هەردوولا جیاوازە لە یەکەمدا (ی) و لە دووەمدا بووە بە (و). ئەم جۆرە رەگەزدۆزیە کتومت وەك رەگەزدۆزی شوێن کەوتوو وایە کە ئەویش بەوە دەوترێ لەو دوو وشەیەدا کە رەگەزدۆزیەکە دروست دەکەن لە یەك دەنگدا لە یەکتری جیاوازیان هەبێ، بەتەواوی لە یەکترەوە دوور بن وەك (یەشم) و (پەشم) لەم دێڕەدا :

---

[24] خۆشخوانی، ل١٣٠.

سم وەکو یەشم و لە پەشمی تووکی پێدا سەرنگوون

چاو وەکو بیجادە یا دوو شەوچراغی شوعلە ڕێژ

بەڵام ئەگەر هاتوو ئەو دوو دەنگەکە جیاوازن هەر یەکەی لە وشەیەکی ڕەگەزدۆزیەکەدا و جیاوازیەکە لە رووی گۆکردنی دەنگەکانەوە واتە شوێنی دەرچوونیان لە زار لە یەکتر نزیك بوون پێی دەگوترێ ڕەگەزدۆزی (موزاریع) وەك شێوان و سێوان لەم دێڕەدا :

لـــە دوگــمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان

بەیـــــانی دا ســپیدەی بــاغی سێوان

جۆرێکی تری ڕەگەزدۆزی ئەوەیە کە ئەو دوو وشەیەی ڕەگەزدۆزیەکەیان دروست کردووە تیپەکانی وشەیەکیان پاش و پێش و تێکەڵ کرابێ، یان وشەیەکیان بەپێچەوانەوە بخوێنرێتەوە راستی ئەویتریان بێت. بەم جۆرە دەوترێ (هەڵگەڕاوە). عەزیز گەردی ئالۆزی بەکار هێناوە[25]، هەڵگەڕاو بەلای ئێمەوە لەبارترە چونکە هەردوو مەبەستەکە دەبەخشێ:

خاترێکی شۆخ و خۆش و بێ غەم و جەمعم هەبو

ئێستە بۆ زولفی کەسێ مەشقی پەرێشانی دەکا

************

لەم گەردشی مینایە کەوا دەورە، نە جەورە

ساقی کەرەمی سایقە، و نالی مەکە ئیلحاح

**************

قەترەیێکە لە بەحری کەرەم و ڕەحمەتی فەتتاح

نەك ئارەقی کەرمی عینەب و شەربەتی توففاح

ئەگەر وشەی (فتاح) و (تفاح) بە ڕێنووسی عەرەبی بنوسرێ ڕەگەزدۆزیە هەڵگەڕاوەکە زۆر بەچاکی دیار دەکەوێ.

ئەم جۆرەی ڕەگەزدۆزی و هەر جۆرێکی تریش ئەگەر هەبێت ئێمە باسمان نەکردبێ لەبەر ئەوەیە لە شیعری نالیدا بەکار نەهاتووە یا زۆر بەکەمی بەکار هاتووە، بەڵام

---

[25] ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی دووەم، ل٢٣.

ڕەگەزدۆزی بە گشتی شێوازێکی دیار و ئاشکرا بوو وەك باسمان کرد کە لە بەرهەمەکانی نالیدا دەرکەوت.

یەکێکی تر لەو هونەرە ڕەوانبێژیانەی کە لە شێوازی نالیدا دەبینرێ و سەر بە بەشی جوانکارین لە ڕەوانبێژیدا جوانی بایسە، ئەمیش بەوە دەوترێ بەڵگەیەك یا سەبارەتێکی جوان و بەجێ بکرێ بۆ خاسەوێژی (سیفەتی) شتێك کە ئەو سەبارەتە و بەڵگەیە لە ڕاستیدا سەبارەتی سیفەتی شتەکە نەبێ[26]. دەبێ بەشێوەیەکی جوان و ناسك و شاعیرانە بێت کە شەوق و جوانی و ڕێك و ڕەوانییەکی تر بدا بە شیعرەکە. ئەم هونەرەش بەپێی خاسەوێژیەکە و بوون و نەبوونی و گومان کردن دوو جۆری سەرەکی هەیە کە هەر یەکەیان لەو جۆرانەش دەکرێن بە دوو بەشەوە. گەلێ هونەرو لایەنی جوانکاری هەیە جگە لە بەهرەی شیعری پێویستی بە ڕۆشنبیری و شارەزایی شاعیر هەیە لەو هونەر و زانستانەدا، بێگومان ڕادەی ڕۆشنبیری و دەسەڵاتی زانستی نالی گەلێ فراوان و بەتوانا بووە، بەکارهێنانی ئەم هونەرە بەڵگەیەکە بۆ شارەزایی نالی لە زانستی ڕەوانبێژی و ئەو زانستانەی کە پێوەندیان بە شێوەو ناوەڕۆکی شیعرەوە هەیە، چونکە بەکارهێنانی ئەم هونەرە دەچێتە ژێر بابەتی ناوەڕۆك و جوانکاری گوزارەییەوە. لەبەر ئەوە ئێمە لێرەدا چەند نمونەیەك لە بەکارهێنانی جوانی بایس دێنینەوە کە بەڵگەن بۆ ئەوەی کە نالی بە شارەزایی و کارامەییەوە ئەم هونەرەی بەکار هێناوە :

لـــە خـــەوفـــی تـــەلعەتی ڕۆژ هـــەر وەکو شێت

بـــە ڕوو زەردی هـــــەڵات و کـــــەوتە کێوان

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

هێند مـــونتەزیری تۆ بوو هـەتـــا چاوی سپی بوو

نێرگس کە لەسەر یەك قـــــەدەم و دیدە چەقی بوو

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

بەپوولێ نامەوێ دەرمان لە نەشئەی چاوی یە عـیللەت

بـــەفلسێ ناکڕم عـــەنبەر لەگەڵ زولْفی ئەوە سەودا

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

---

[26] ڕەوانبێژی ، بەرگی دووەم، ل٨٦.

دڵم بەردە ئەگەر شاخە بە چاوی سووکی مەڕوانێ
بـــەخۆڕایی نەسوتاوە ئەمیشە کێوی تووریکە

بەکارهێنانی ئەم هونەرە ڕەوانێژیانە لە دێڕە شیعرێك یان پارچەیەکدا کە نالی بەکاری هێناوە بریتیە لە پەیامێکی زمانەوانی یا ڕاگەیاندنی بیرێکی جوان بەهۆی هەڵبژاردنی دەستوور و یاساکەیەوە خۆیان دەنوێنن کە لە کەرەسەی زمانەکەدا کۆبۆتەوە بەشێوەیەك کە (دوو ڕووی گرنگی شێوازگەری دیاری دەکەن : یەکەم لە ڕووی وتە و دەستەواژەکانەوە وەك تاکە بەشێك لە کاری بنیات نانی بەرهەمە ئەدەبیەکەدا. دووەم : لەڕووی لێکدان و داڕشتنی ئەو بەشانەوە لە بۆتەی بنیاتی زمانەوانی گشتی تێکستەکەدا. لەسەر ئەم بنچینەیە خاسیەتەکانی شێواز یەکانگیر دەبن و سیمایەکی بنچینەیی تایبەت بۆ کارەئەدەبیەکە دیاری دەکەن)[27].

لە ئەنجامی ئەم بۆچوون و شیکردنەوە شێوازگەریەوە دەتوانین بڵێین وردی و بەتوانایی و شارەزایی نالی، بەرهەمەکانی کردووە بە بەرهەمێکی هونەری بەرز و خاوەن شێوازێکی تایبەت، چونکە هەر هونەرێك کەرەسەی بنچینەیی هەیە، هەموو هونەرمەندێکیش سەرکەوتوونابێ لە بەکارهێنانی ئەوکەرەسانەدا و ناتوانێ هونەرێك دروست بکا، تا شارەزایی و توانا و بەهرەی هونەرمەندێتی نەبێ.

نالی خاوەنی سەرمایە و فەرهەنگێکی دەوڵەمەندی وشە و زاراوەی زمانی کوردی بووە، بە سەلیقەیەکی وردو بەتواناوە توانیویە جۆرە وشەیەك هەڵبژێرێ و ڕێکیان بخات کەهونەرێکی ڕەوانبێژی دروست بکەن، بەتایبەت ڕەگەزدۆزی، لەگەڵ بەتوانایی و سەلیقەی شیعریدا دیاردەیەکی فۆنۆلۆژی و ڕێنووسی کوردی کە تایبەتە بە نووسینی دەنگەکانەوە. ((ڕێنووسی کوردی هەر لەسەرەتای بوونییەوە نووسینێکی فۆنیمی بووە، ئەگەرچی جاروباریش لەسەر ئەم بناغەیە لایدابێت. هەر لەسەرەتاوە هەوڵی ئەوە دراوە بەرامبەر هەر دەنگێك (فۆنیمێك) تیپێك یا نیشانەیەك هەبێت. هەندێ جار نووسەری کورد بەوەشەوە نەوەستاوە، تەقەلای ئەوەی داوە کە تەنانەت دەنگە نا گرنگەکانیش

---

[27] المقايس الاسلوبية فى النقد الادبى، عبدالسلام المسدى، ص١٦٠.

(ئەلۆفۆنەکان) بنوێنن))[28]، هەرچەندە ئەم ڕێنووسەی کە نالی شیعرەکانی پێ نووسیوە بە ڕێنووسی عەرەبی بووە، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەڵێین نالی ئەم ڕاستیەی زانیوە و ئاگاداری ئەو تایبەتیەی زمانی کوردی بووە لە رووی جیاوازی و شێوەی دەنگەکان و تەنانەت ئەلۆفۆنەکانیشەوە، بەڵگەی ئەم ڕاستیەشمان بە ئەنقەست نووسینی نالیە بە زمانی کوردی و دەربڕینی ئەو مەبەستانە لە چەند پارچە شیعرێکدا. هەروەها ئەو وشانەی نالی بەکاری هێناون لە ڕێنووس و شێوەی گۆکردن و دیاردەی فۆنۆلۆژی دا نەبێ جیاوازی وشەیەك لەگەڵ یەکێکی تر یا تەنیا وشەیەك ئەو فرەمانابیە هەڵناگرێ ئەگەر ئەو جیاوازیە نەبێت جگە لەوەی کە شیعر هونەرێکە لە هونەرە دەنگیەکان ئەگەرچی لە شێوەی نووسینێکیشدا دەردەبڕێ، بەڵام دەبێ لەکاتی خوێندنەوەیدا هەروەك هونەرێکی دەنگی مامەڵەی لەتەکدا بکرێت.

## شێوازی شیعری سالم

تا ئێستا ئەو دیوان و پارچە شیعرە چاپکراوانەی کە بەرهەمی شیعری سالمیان بڵاوکردۆتەوە، تەنیا بریتی بوو لە کۆکردنەوەی شیعرەکانی و چەند دێرێك لە بارەی ژیان و بەسەرهاتی شاعیرەوە. بەهیچ جۆرێك لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەگرانە یان توێژینەوەیەکی ئەدەبی لەسەرە شیعرەکانی نەکراوە، تەنانەت ناراستەوخۆش هێما و ئیشارەتێکیان نەکردووە بۆ شێوازی شیعرەکانی و تایبەتێتی و شقڵی سالمیان پیشان نەداوە جگە لەم کورتە نووسینانە نەبێ کە لەگەڵ باسی ژیان و شیکردنەوەیەکی سادە و ساکاری شیعرەکانیدا بە کورتی و لاوەکی لەم بارەیەوە چەند دێڕێکیان نوسیووە وا لێرەدا پیشانی ئەدەین.

---

[28] محمد معروف فتاح، ڕێنووسی کوردی لە روانگەی فۆنەتیکەوە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کوردی، بەرگی نۆهەم، ١٩٨٢، ل٢٤١.

عەلائەددین سجادی دەڵێ : لە شیعری بێگانەدا بێجگە لەوەی کە دڵی لە وردەکاری (کەلیم) چووە مەفتونی شیعری (حافظ) ی شیرازیش بووە[29]، لە هەندێ شوێنی تریشدا لە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی شیعرەکانی سالمدا هێمای کردووە بۆ وردی و قووڵی بەکارهێنانی هونەرەکانی رەوانبێژی وەك لێکچواندن، جوانکاری وشەیی . . . هتد[30].

رەفیق حیلمی لە شیکردنەوەی هەندێ پارچەی غەزەلەکانی سالمدا روو لە بەکارهێنانی وشەی لەبار و گونجاو دەکا لای سالم، کە بۆ بەدی هێنانی هونەرە رەوانبێژیەکان وەك رەگەزدۆزی وجوانی بایس بەکاری هێناون لەبارەی رەگەزدۆزیەوە دەڵێ : چاوتان لەم جناسە بێ کە لە وشەکانی (دلبەر) و (دڵ بەران) بەکاری هێناوە[31]، دیسان دەڵێ (ئەی لەم بەلاغەتە ئەفکرن کە لەم (تەعلیل) و عوزر هێنانەوەیەوە لەم خاڵە ورد و شاعیرانەیەدایە کە خراوەتە میسرەعی دووەمی ئەم بەیتەوە؟![32].

وەك لەسەرەتای ئەم بەشەدا وتمان پارچە شیعرەکانی سەرچاوەی ئەم لێکۆڵینەوەیەن، لێرەشدا بەپێی ئەو تایبەتی و شێوازە دیار و ئاشکرایانەی لە شیعرەکانی سالمدا دەردەکەون تایبەتی و رەگەزەکانی شێوازی سالم دیاری دەکەین.

## بیروردی

یەکێکە لە رەگەزە بیرییەکانی شێواز، لێرەدا نامانەوی لێدوان و توێژینەوەی تایبەت بەم رەگەزەوە دووبارە بکەینەوە چونکە لەباسی شێوازی نالیدا باس کراوە. ئەم رەگەزە تایبەتیەکە لە تایبەتیەکانی شێوازی شیعری سالم و ئەوەندە دیار و ئاشکرایە، لە خوێندنەوەی چەند پارچە شیعرێکدا زۆر بە روونی ئەم رەگەزە بەدی دەکرێت، دەتوانین بڵێین پارچە شیعر و غەزەل و قەسیدەیەکی سالم نییە زۆر بە وردی ئەم رەگەزەی

---

[29] عەلائەددین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، ل٢٦٥-٢٦٦.

[30] عەلائەددین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، ل ٢٦٦-٢٧٥.

[31] رەفیق حیلمی، شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی دووەم، چاپی دووەمی هەردوو بەرگەکە، هەولێر،ل٦٩.

[32] سەرچاوەی پێشوو.

تیا بەکار نەهێنرابێ. ئەم رەگەزە وامانلێدەکات کە بلێین سالم لە وردی دەبڕینی بیرەکانی و وردەکاریدا هیچی لە شیعرەکانی نالی کەمتر نییە، ئەگەر بەرامبەر نەبن لە وردی و قووڵی مانا و واتادا. ئەم رەگەزە وای لە سالم کردووە لە هەموو پارچە شیعر و غەزەلێکیدا رەنگ بداتەوە و جێگیری بکا. سالم بیر وردی و ناوەرۆکی بتەوو قوڵ و وردەکاری سەرجەمی دیوانەکەی لە قەسیدەیەکدا کە بۆ میرزا سلێمانی زین درووی وتووە دیاری دەکا و وەك رەخنەگرێك رەگەز و تایبەتیەکانی شێوازی شیعرەکانی لەو قەسیدەیەدا پێناسە دەکا و بە شتی ورد و تیژ وبەکاری پیشەیی دەیانچوێنێ:

نـــووکـــی قــەڵەمم تیژە وەك نووکی درەوشی تۆ

ســــــووهان زەدەیە فیکرم وەك گازنی بــــوڕانت

رەنگینە هەموو شیعرم وەك نەقشی تەکەڵتوی زین

مـــــەزمـــــونکەشە فیکرم وەك قولاپی دروومانت

بۆ دەرخستنی بیر وردی و بەتوانایی لە وردەکاریدا و شوێن کەوتن و هاوڕێیەتی نالی لە قوتابخانە شیعریەکەیاندا، پارچە شیعرێکی لە دیوانی نالی هەڵبژاردووە و کردوویە بە پێنج خشتەکی لەو شیعرەدا نالی بیرو را فەلسەفیە قوڵەکانی بڵاوکردۆتەوە لەبابەت ژیانی ئەو ئادەمیزادەی بۆ خۆی دەژی[33]. سالم ئەو چوار دێڕە شیعرەی نالی تەخمیس کردووە، بۆ مەبەستی دەرخستنی بەتوانایی خۆی لە وردەکاری و وردبینیدا جگە لەوەی پلە و پایە و رادەی هونەرمەندی نالی و ووردی لەو پارچە شیعرەدا پیشان داوە و بەلایەنی شیعرێکی بەرز و بەنرخ و پڕ واتا و ووردەکاری بووە بۆیە ((سالم هەوڵ دەدا هەندێ لە رەمزەکانی نالی ئاشکرا و روون بکاتەوە لەو کاتەی کە سێ نیوە دێڕ زیاد دەکا لەسەر هەر دێڕێك (دوو نیوە دێڕ)، یاخود درێژە بە کورتی ماناکان دەدات، هەروەها وێنەکان لە تەرکیزەوە دەباتە فراوانی و درێژە پێدان[34]. ئەمەش ئەو پێنج خشتەکیەیە کە شێوازی وردو داهێنانێکی بەرزی تێدایە:

ئـــــەی حاریس ئەگەر دەوڵەت و جاه و حەشەمت بوو

---

[33] د. مارف خەزنەدار، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردیەوە، بەغدا، ١٩٨٤، ل١٩٠-١٩١.

[34] سەرچاوەی پێشوو، ل١٩١-١٩٢.

دورِ و گەوهەر و لوئلوئو لــــــەعل و دڕەمت بوو

خووبـــان و سیەهـ موو و پـــەری رووخەدەمت بوو

هـــــەرچەندە کە عومری خدر و جـامی جەمت بوو

چـــونکە ئەمەلت زۆرە چ عومرێکی کـــەمت بوو

سالم لە هەندێ دێڕە شیعردا بە هیوای ئەوەی بیرە وردەکانی روونکاتەوە جۆرەهونەرێك بەکاردێنێ کەلە نیوەی یەکەمی دێڕە شیعرێکدا بیرەکەی دەردەبڕێ، لە نیوەی دووەمدا نمونەیەکی وەك ئەو بیرە دێنێتەوە بۆ روون کردنەوە یا دەرخستنی تایبەتێتی و خاسیەتی بیرە پێشووەکەی، کەچی دەبینین لە دووەمیشدا وردەکاری و بیر وردی فەرامۆش ناکا، وشە و زاراوەیەك ریز دەکا کە بیرو واتایەکی قولّ هەلّبگرێ.

ئەبەد قەت سڕی ئەندامت بە تای جامەی کەتان نابێ

بـــەلّێ شەوقی چـــرا ئەلّبەت لە فانۆسا نیهان نابێ

زەمـــانە قەت لەگەلّ ئەولادی ئادەم باوەفا نابێ

وەکو گوربەی سیەهـ ئەسلاّ بە مەردم ئاشنا نابێ

**************

وەکو یەك دێتە بەر گوێی پیاوی ئەحمەق

نـــەفیری بلبل و ئـــاوازی لـــەق لـــەق

## ئالّۆزی

شێوازێکی دیار و ئاشکرای تری سالم ئالّۆزییە (تعقید) کە ئەم تایبەتیەش لە وشە و دارِشتنی ئالّۆز و ئالّۆزی واتاش لەپێناوی ناوەرۆك و بیر وردیەکەیدایە ئەم رەگەزە لە رەگەزە بیریەکاندابەرامبەر رەگەزی روونی دەوەستێ، شێخ نوری شێخ سالّح لەبارەی ئالّۆزیەوە دەلّێ ((تعقید زدی وزوحە یەعنی بە فکرێك ئەلّێن ئینسان وازیحا تێی نەگات))[35].

---

[35] م.نوری مزیاتی عمومی اسلوب، رۆژنامەی ژیان، ژ٤٦،١٦ کانونی اول، ١٩٢٦.

سەجادی گرێ لێدانی بەکار بردووە بۆ ئەم بابەتە[36] و ئەویش وەك زۆربەی نووسەرە عەرەبەکان لەپێش باس کردنی زانستی رەوانبێژی و لە تەك زمانپاراویدا (فصاحە) باسی دەکەن. لەم رووەوە سەجادی دەڵێ ((راستە گرێ لێدان بەلای زانایانی رەوانبێژیەوە لە هونەرەکانی رەوانبێژی نییە، بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کە ئەم گرێ لێدانەکامەیەو چییە؟ ئەوە بەلای منەوە باسکردنی گرێلێدان لە باسی بابەتەکانی رەوانبێژیدا باسبکرێ[37] بەپێی بۆچوونی ئێمەش جیاکردنەوەی لە رەوانبێژی بە راست دەزانین، بەڵام دەبێ بە رەگەزێکی شێواز دابنرێ لە بابەتی شێوازدا باس بکرێ. چونکە بەرامبەرەکەی کە روونییە بە رەگەزێکی شێواز دانراوە ئیتر چۆن دەبێ بەرامبەر پێچەوانەکەی لەم بابەتە دور بخرێتەوە؟.

ئاڵۆزی بەوە دەوترێ : کە وتە و وشەکان لە دەربڕینێکی زمانیدا بە ئاسانی واتایەکی ئاشکراو دیار نەدەن بەدەستەوە. ئەمەش بە دوو شێوە دەبێ :

### ١. پێی دەوترێ ئاڵۆزی بێژەیی :

وشە و رستەکان بە شێوەیەکی نا باوو رێکدەخرێن کە لەگەڵ یاسا و دەستووری ئەو زمانەدا جیاواز بێت، خوێنەر یا گوێگر هەست بە نارێکی و ئاڵۆزی پێکهێنانە رێزمانییەکە بکات. ئەمەش وا دەبێ بەهۆی پاش و پێش خستنی بەشەکانی رستەوە روو دەدات، یا زۆری بەکارهێنانی راناوەکان لە رستەیەکدا یا لە دێرە شیعرێکدا دەبێتە هۆی ئاڵۆزی و جیانەکردنەوەی واتاو مەبەست لەو راناوانە.

### ٢. ئاڵوگۆڕی زاراوەیی :

ئەمەش بەشێوەیەك دەبێ کە خوێنەر یا گوێگر لە روی واتا و گوزارەوە بۆ ئەو بیرە نەچێ کە مەبەستە، بەڵکو دێرە شیعرەکە مانا و واتایەکی تریش بدا بەدەستەوە کە ئەمەیان مەبەستی شاعیر نەبێ. (لەم گوزارەییەدا وا دیارە خوازە و درکە و خواستن بە تەواوی دەستیان تێدا هەیە، با رستەش پەخشان بێت،

---

36 عەلائەددین سجادی، خۆشخوانی، ل١٢.

37 خۆشخوانی، ل١٣.

چونکە خاوەن رستە بە بەکارهێنانی هەندێ وشە لە رستەیەکدا ئیشێکی وا ئەکا کە بەتەواوی خۆی لە گوزارە راستەقینەکە دوور ئەخاتەوە[38]

شەڕیانە لەسەر ئەندێشەی ئەو مؤمین و تەرسا
کێشاویە لەسەر مـــەسحەفی روو شکڵی چەلیپا
ئەوەندە عوقدەی نیهانم کەوتە ناو دڵ
دەتـــرسم مـــــایەیی ئەم دەدە دەردا

* * * * * * * * * *

لەبی تۆ مەعدەنی مەرجانە نەك یەم
مـــەحەلی شکە ئەوتۆ جێی یەقینی

* * * * * * * * * * * *

ســەقەر و بــاغی ئیرەم دوورە بە یەکـــن سالم
بۆنی من دۆزەخی ئەو بۆسەیی ئەو کەوسەری من

## شێوازی هیندی

هەوڵ و تەقەلای لێکۆڵینەوە شێواز خوازییەکان زۆرجار لە سنوری رواڵەتی بەرهەمی شاعیرێك دەچێتە دەرەوە و سەر بۆ ناوەرۆك دەکێشێ توێژینەوەی وشە و رستە و شێوازی دەربڕینی شاعیرێك بە ئامانج و هیوای دەرخستنی گەلێ لایەنی تری ژیانی شاعیرەکە دەبێت کە کاریگەرییان هەیە لەسەر بەرهەمەکانی شاعیر و دەبنە هۆی ئەوەی ئەو شاعیرە جۆرە شێوازێکی تایبەتی هەبێت، هەروەها پێوەندی باری ژیان و باری کۆمەڵایەتی و جۆری ژیانی ئەو سەردەم و دەوروبەری شاعیرە کە پەیوەست و هاوجۆرە لەگەڵ ئەو تایبەتی و خاسیەتانەی کە لە شێوازی بەرهەمەکەیدا هەیە و دەردەکەوێ.

مەبەستی سەرەکیمان لێردا ئەوەیە کە ژیانی سالم و باری غەم و پەژارەی بەدرێژایی تەمەنی و ئالۆزی باری کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەو سەردەمە و نالەباری چەرخو ئەو

---

[38] خۆشخوانی، ل١٥.

شکستی و ناهەمواریەی بەسەر نەتەوەو وڵاتەکەیدا هات، دەبنە هەوێن و ڕەنگدانەوەی ئەو ژیانە لە بابەت و ناوەڕۆکی شیعرەکانی سالمدا ڕەنگ دەدەنەوە. بێگومان بۆ دەربڕینی ئەو جۆرە ناوەڕۆك و مەبەستانە هەموو شێوازێك دست نادات. لەبەر ئەوە سالم جۆرە شێوازێکی سەخت و گران وئالۆزی هەڵبژاردووە و کردوویە بە شێوازێکی دیار و بۆ زۆربەی بەرهەمە شیعریەکانی. ئەو شێوازەش بریتیە لە شێوازی هیندی کە لە ئەدەبیاتدا بە ( سەبکی هەندی)ش ناو دەبرێ.

ڕادەی ڕۆشنبیری سالم و ئاشنایی لەگەڵ ئەدەبیات و بەرهەمی شاعیرانی ئێراندا هۆیەکی تری پێڕەوی کردنی شێوازی هندیە لەلای سالم. چونکە ئەگەر سالم ئاگاداری ئەو تایبەتی و خاسیەتانەی شێوازەکانیش نەبووبێ، بەلای کەمەوە ئەو تایبەتیانەی لە شیعری ئەو شاعیرانەدا بەدی کردووە و لەگەڵ زەوق و سەلیقە و توانایدا گونجاوە و لە شیعرەکانیدا پێڕەوی کردووە، چونکە ئەم شێوازەی بە لەبارترین و چاکترین شێواز زانیوە بۆ دەربڕینی ئەو کەف و کوڵ و باری دەروونە نائارامەو دەربڕینی بیرەکانی، لێرەدا بەپێویستی دەزانین بەکورتی باس لەو شێوازنە بکەین، چونکە بە گشتی کاریان کردۆتە سەر ئەدەبی کلاسیکیی نەتەوە موسوڵمانەکانی ئێران لە هاتنی ئاینی ئیسلامەوە شاعیری نەتەوە موسوڵمانەکان لە شیعر و ئەدەبیاتیاندا بەپێی مێژوو سەردەم سێ جۆر شێوازیان پێڕەو کردووە :

١. شێوازی خۆراسانی (سەبکی خۆراسانی) کە بە ( سەبکی ترکستانی)ش ناوبراوە.

٢. شێوازی عێڕاقی (سەبکی عێڕاقی).

٣. شێوازی هیندی (سەبکی هیندی)[39].

لە پاشانا بەتایبەت لە سەردەمی قاجاریەکاندا (بازگشت ادبی) گەڕانەوەی ئەدەبی هێزی پەیدا کردووە و شێوازی کۆن و شاعیرەکانی سەردەمی خوارزمی و سەلجووقی و غەزنەوی برەوی پەیدا کردەوە[40]، ئەم شێوازانە هەر یەکە لەسەردەمێکی دیاریکراودا ڕێبازێکی ئەدەبی بوون، هەریەکە و کۆمەڵێ شاعیرو نووسەر پێڕەویان کردووە. گەلێ

---

[39] علی اکبر شهابی-خراسانی، روابط ادبی ایران و هند در آدبیات دوره صفویه، ١٣١٦، ص٨٣.

[40] محمد تقی بهار((ملك الشعراء))، سبك شناسی ، جلد اول، چاب دوم، مقدمة منصف، ص یا.

لە شاعیرەکانی نەتەوەکانی تریش کەم تا زۆر کاریگەر بوون بەو جۆرە ڕێبازانەوە، بەڵام ئەوەش لە یاد نەکەین کە شاعیرانی کورد بەپێی سروشت و تایبەتی زمان و ئەدەبی خۆیان گۆڕان و دەسکاری دەستوور و ڕەگەزەکانی ئەو شێوازانەیان کردووە.

وەك لەوەوبەر وتمان سالم لە زۆربەی شیعرەکانیدا پێڕەوی شێوازی هیندی کردووە، لەبەر ئەوە کە شێوازێکی دیار و جیاکەرەوەی سالمە، لێرەدا بە کورتی تایبەتیەکانی ئەم شێوازە دیاری دەکەین. ئەمەش بەهۆی ئەو نمونە شیعریانەوە کە بە تەواوی تایبەتیەکانی ئەم جۆرە شێوازەیان تیا بەدی دەکرێ:

١. ناوەرۆکی وردو ناسك ، بیری پێچهەڵپێچ و ئاڵۆز، ئەندێشەی دوور لە سروشت و بەکارهێنانی هونەری ڕەوانبێژی وەك خوازە و درکە، هەروەها بەکارهێنانی جۆرە لێکچواندنێکی (سەخت و ڕەق) کە تایبەتە بە زەوق و سروشتی هیندیەکانەوە. پاڵاوتەی ئەم تایبەتیە لە زاراوەی (خیاڵبافی) بژارەکاریدا واتای پڕاو پڕ دەدا[41]. لەم نمونانەی خوارەوەدا لە شیعری سالمدا ئەم تایبەتیە دەردەکەوێ :

لە بـــاغا غونچە مەشقی لێوی تۆی کرد
نوخوستین گوڵ لەخەندەی تۆوە پشکووت (سالم)

*********

لەسەر سەبزی چیمەن یاری سهم قەدم کە جلوەی کرد
لە سوجدەی خاڵی لا لێوی بنەوشە گەردەنی خەم بوو

***********

بەخوڕ خوێن بێنە ئەی گریە لە چاوەی چاوی تاری من
حنا لازم بووە بـــۆ پێی ســەگی کـــــــۆی نیساری من

*********

ناکەن هەوای هیچ کەبابێ زەلیلی شەهر
بریانە بەس لە ناری غەما پارەی جگەر

***********

---

[41] روابط آدبی، ص٩٣.

ســــــووتا دڵم بە حاڵەتی جوباری (سەرچنار)

لێلاوە چــــەشمە ساری وەکوو چاوی بێ بەسەر

وەك چـــاوی بێ غەمانە هەموو شیوی (ئاودار)

بەس موشکیلە لە چەشمەی ئەو قەترە بێتە دەر

٢. دەربڕینی بێزاری لە ژیان و پیشان دانی خراپە و جەور و ستەمی دنیا لە شیعرەکاندا، بە تایبەت رەشبینی بەرامبەر بە ژیان و دەربڕینی خراپە و ناحەزی و دزێوی خەڵکی خراپ، چاوەڕێی خراپە بینین لە خەڵك و دنیاوە[42].

دەزانی باغی بەختی ئەهلی دڵ بۆ قەت سەمەر نادا

فەلەك هەرگیز موورادی مەردمی ساحیب هونەر نادا

**************

سیەه بەختی جودا نــــاکا دڵی سالم لە توڕەی تۆ

بە مەحزی کەشمەکەش سەر رشتەیی ئەم کارە بەرنادا

****************

تەماشای جەوری دنیا کەن چ قەهرێکی لە خوسرەو گرت

نـــەبـۆ تاجــــــی نیشانی مـــا نەبۆ تەختی نیا پێدا

٣. دەبڕینی غەم و پەژارەو نەخۆشی، ئارەزوو کردن و حەز کردن لە ئێش و ئازار و غەم خواردن بەم شێوەیە ئەم بیرانە دەردەبڕن زۆر تیادا قوڵ دەبنەوە و هووشەکاری و مبالەغەی زیاد لە پێویستی تیا بەکار دێنن[43] :

غــــــــم وەکو یەم هاتە جۆش و کەوتمە گێژاوی بەلا

ئـــــــاوی هائیل زایە کــەشتی کەوتمە حاڵی حەلوەلا

شەتی میحنەتی هات لەسـەردا کەشتی هۆشی راڕفان

بادی غەم لێم بوو بە شورتە جیسری شادیم تێك شکا

**************

---

[42] روابط ادبی، ص١٩٣

[43] روابط ادبی، ص٩٥.

ئەگەر باوەڕ ئەکەی سـەوگەند بە ئەبڕۆت

هـیـلال ئـاسا خـە می دەمبۆ مەهی رووت

دووسـەد عـوقـدەم لە دڵدایە بە بێتۆ

درۆ نـاکەم بە عـوقدەی چینی گێسووت

٤. لە زۆرەبەی شیعرەکانیاندا ئەم شێوازە بۆ دەربڕینی شانازی بەکاردێنن بۆ باوەڕ بە پلە و پایەی بڵندی شاعیرێتی و دەربڕینی جۆرە فیزلێدان و کەشخەیەك. ئەمە لەلای سالم زۆر بە کەمی دەردەکەوێ ئەوەشی لە شیعرەکانیدا دەبینرێ ئەو پلە و زانابیەی خۆی بە کەم زانیوەو زۆر بە لەخۆ بوردن و خۆ بەکەم زانینەوە باسی خۆیی و شیعرەکانی دەکا. مەگەر ئەم تەوازع و خۆ بەکەم زانینەی واتا ومەبەستی بەرزی بێ و شانازی پێوە کردبێ.

زیـرە سەرمایەیە بۆ سـالم و (کرمان)ی دەبا

شیعری کوردی کەبدا جیلوە لەلای شێخی کەبیر

(زیرە)ی وردو جیلوە بەخش لەلای سالم بریتیە لە شیعر بە زمانی کوردی، بۆیە سالم بەدیاری بۆ کرمانی دەبا کە (کرمان) خۆی مەڵبەندو سەرچاوەی زیرەیە. سالم بەشێوەی خۆ بەکەم زانین ئەوە دەردەبڕێ کە ئەمیش توانای ئەو جۆرە شێواز ودەربڕینەی هەیە کە ئەوان پێڕەوی دەکەن.

مـەکە تەقریری عیلم و فەزڵی سالم

بە ئاوی عیشقی تۆ شۆشتوویە دەفتەر

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

ئـەی رەفیقان بێنەوە نوکتەی عەجایب بشنەون

سالمی مەجنون لە عەشقا مەیلی تەدبیری هەیە

نووکی قەڵەمم تیژە وەك نووکی درەوشی تۆ

سـووهان زەدەیە فیکرم وەك گازنی بوڕانت

❊❊❊❊❊❊❊❊

ڕەنگینە هەموو شیعرم وەك نەقشی تەکەڵتوی زین

مـەزموون کـەشە فیکرم وەك قولاپی درومانت

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

نیگەهێ ئەی شەهی مەردانی جیهان
(سالم)ی غــەم زەدە دیوانی هــەیــــە

وەك پێشتر وتمان شاعیر بە ئارەزووی خۆیی و بەپێی تواناو سەلیقەی خۆی زۆر جار لەو رێباز و دستوورانەش لادەدا و مەرج نییە پڕاو پڕ هەموو تایبەتیەکانی ئەو شێوازە بەکار بێنێ یان هەر هیچی لێ پشت گوێ نەخا، تەنانەت لەو شاعیرانەی شێوازی هیندیان بەکار بردووە وەك سائیب تایبەتیەکانی شێوازی جار جار فەرامۆش کردووە ( راستە ئەوەی لەسەر شێوازی هیندی وتراوە، کە وشەو وتەکان دەبنە قوربانی واتا و ناوەرۆك و جوانکاری واژەیی پشتگوێ دەخرێ، بەڵام لای سائیب بەو شێوە نییە)[44]، لەلای سالمیش دەبینین لەگەڵ ناوەرۆکی ورد و قوڵ و پڕ واتادا بەتوانایی و دەسەڵاتی لەهەڵبژاردنی وشە و بەکارهێنانی هونەرە جوانکاریە واژەیەکاندا دەردەکەوێ.

لە شیعرەکانی سالمدا بە هۆی دووبارە بوونەوەی ناوەرۆك و لەیەك چوونی بیرەکانی سالم، دەبینین کۆمەڵێ وشە و زاراوەو داڕشتنی زمانەوانی تایبەت بە سالمەوە دووبارە دەبنەوە. ئەم دووبارەکردنەوانە بۆتە هۆی رازاندنەوەو جوانی رواڵەتی شیعرەکان لەگەڵ وردی و قووڵی ماناکاندا بەهۆ بەکارهێنانی هونەرە رەوانبێژیەکانەوە وەك لێکچواندن و رەگەزدۆزی و پێچ و پەخش . . . هتد.

لەم نمونانەی خوارەوەدا چەند وشەیەك دووبارە دەبنەوە کە هەر یەکە جۆرە داڕشتنێکی هەیە و دووبارە بوونەوەی واتا و ناوەرۆکیش دەگەیەنن، لەلایەکی تریشەوە سەلیقە و زیرەکی سالم لە بەکارهێنان و هەڵبژاردنی وشەکاندا دەردەکەوێ، ئەگەر وردتریش وەکو شیکردنەوەی شێوازگەری بۆی بچین ئەم جۆرە شێوازی لای سالم لە بچوکترین دانەی زمانەوە بۆ نمونە لە دووبارە بوونەوەو زۆر بەکار هێنانی هەندێ وشەدا بەتایبەت لە دێڕە شیعرێکدا بەمەبەستی جیاکردنەوەی ئەو دەنگانە بووە کە لەلایەکەوە نزیکن و بەهەڵە جێگۆڕکێیان پێ دەکرێ. وەك دەنگی (خ، غ) لە وشەی خم و غم دا. بەکارهێنانی راست لەم شیعرانەی سالمدایە، چونکە بە گۆڕینیان واتای وشە

---

[44] ضیاءالدین سجادی،معنی و مضمون در شعر صائب،صائب و سبك هندی،محمدرسول دریاگشتی،ص٥٧.

که دەگۆڕێ و پێوستە بە راستی وەك سالم بەکاریهێناوە بەڕاستی لەشوێنی خۆیدا بەکار بڕێن.

زولفی تۆ موو بە موو خەریکی خەمە
دلــی مـــن نەو بە نەو غەرقی غەمە

* * * * * * * * *

خەمی قەددم لە غەمدا شێوەی ئەبرۆتە تا مووتە
بەدائم پێچشی خـــاگر وەکوو گێسووتە تا بووتە

* * * * * * * * * * *

دەپرسی گەر لە مەهجوورت بە پەیکانی موژەت
خـــەمیدە قامەتە سالم کەمان ئاسا لە هیجرانت

دووبارەکردنەوەی وشە و زاراوە هونەرمەندێتی سالم دەردەخا لەم دێڕە شیعرەدا، بەکارهێنانی وشەی (مانی) لەرووی واتا و بەکارهێنانی هونەرە رەوانبێژیەکانەوە دوو ئەوەندەی دووبارە بوونەوەی وشەکە هونەری تێدایە و واتای زیاتر هەڵدەگرێ :

بەجوز مانی مسەوور قەوسی ئەبرۆی تۆی نەکێشاوە
کـــەمانی نەقشی کێشابێ دەبێ هەروا کەمانی بێ

* * * * * * * * *

مـەپۆشە روو بە رووم روی ئافتابت
بەبێ رووی تۆ دەلەرزێ سالمی رووت

جگە لە دووبارە کردنەوە لە تاکە دێڕێکدا یا لە پارچە شیعرێکدا دووبارە کردنەوەی وشە و زاراوە و دەربڕینەکان لە غەزەل و پارچە شیعرەکاندا دەبینرێ لە چەند لایەك و زیاد لە چەند جارێك هەر ئەو ووشە و دەربڕینانە دوبارە بوونەتەوە :

دڵ لـــە میحنەت کەیلە ڕێم کەن خەڵکە با دەرچم لە شار
ئـــــەمرۆ رۆژێکە لە جەمعی مەردوومان بگرم کـــەنار
دەستـــــەو ئـــەژنۆ دانیشم بێچارە و زار و نـــــزار
((مـــــوسم عید است ومـــا نومید از دیـــدار یار
عالمی در عیش و نوش و مــــــا دوچشم اشکبــــار))

لێم گەڕێن با گۆشە گیر بم دەستەو ئەژنۆ کەف زەنان
گێژەڵووکەی بای نەدامەت تاری کرد سەفحەی جیهان
دڵ لە میحنەت کەیلە مەیلی سەیری ناو شارم نییە
عـــەینی چاوم خـــوێنی تێزاوە لە داخی مەردومان

لێرەدا نامانەوێ بە نمونە هێنانەوە درێژەی پێ بدەین، گەشتێك بەناو دیوانەکەی سالمدا گەلێ نمونەی لەم جۆرە شێوازەمان پیشان دەدات.

دیاردەیەکی دیکە لە شیوازی شیعرەکانی سالمدا بەتایبەتی دەردەکەوێ کە ئەویش بریتیە لە پاش و پێش کردنی بەشەکانی رستە لە داڕشتنی دێڕە شیعرەکاندا. ئەم جۆرە شێوازە لەلای زۆربەی شاعیرانی تریش دەبینرێ، بەڵام هیچ کامیان وەك سالم بەهونەرمەندی و شارەزاییەوە و بەزۆری ئەم شێوازەی بەکار نەهێناوە. ئەم هونەرە لە رەوانبێژیدا لەبەشی زانستی واتاناسی (گوزارە کاری)دا باسکراوە زۆرەبەی سەرچاوەکان لە ژێر ناونیشانی (پێش خستن)دا باسی دەکەن بەهۆی ئەو گرنگی و تایبەتیانەی کە لەو بەشەدا هەیە و شاعیر مەبەستیەتی پێشی بخات[45]. ئەم پاش و پێش خستنە بریتیە لەوەی کە شاعیر لە رستەیەکدا، لە دێڕە شیعریکدا بەشێکی سەرەکی لە بەشەکانی رستە پێش دەخا. واتە شاعیر پێڕەوی دەستوور و یاساکانی زانستی سینتاکس ناکات لەدروست کردنی رستەکانیدا. ئەمەش وەنەبێ لە ئەنجامی نەزانین و بێ ئاگایی شاعیرەوە بێت،بەڵکو شاعیری سەرکەوتوو و بەتوانا، ئاگاداری هەموو دەستوور و بنەما زمانییەکانە، هەرچی ئەو لادانەشە واتە ئەو پێش و پاش خستنە بە ئامانج و هیوای گەیاندنی واتایەکی تایبەتە لە شیعرەکەدا و بەهۆی ئەو کارەوە سەرنجی خوێنەر رادەکێشێ و مەبەستی شاعیر دەگەیەنێ، لە زانستی سینتاکس دا لەزمانی کوردیدا ریز کردنی رەگەز و بنچینەکانی رستە هەمیشە بە (بکەر) دەست پێ دەکات، جێگای

[45] بڕوانە ئەم سەرچاوانە: دلائل الاعجاز(فی علی المعانی، الامام عبدالقاهر الجرجانی، بیوت، ١٩٧٨، ص٨٥-٨٨: عەزیز گەردی، رەوانبێژی، بەرگی سێیەم، ل٥٧-٥٨.

کردار لە کۆتایی رستەکەدایە. و بکەر و کردار و راناوی رێکەوت ، سێ بەشی بنجین کە رستەی سادە لە زمانی کوردیدا پێك دێنن[46].

یەکێ لەو مەبەستانەی کە رەگەزێکی رستەی لە پێناودا پێش دەخرێ بۆ نمونە پێش خستنی کار بۆ مەبەستی خەبەردانێك جا ئەو خەبەرە خۆشی و مزگێنی بێ یا ناخۆشیەکی تێدا بێ. زۆربەی پێش خستنەکان لە شیعری سالمدا بۆ گەیاندنی خەبەری ناخۆشن.

ئەم پاش و پێشە بە مەبەستی مزگێنی و خۆشیە (ئەگەر) ژیانی سالم بێ غەم و ناخۆشی و دوور کەوتنەوە بێت :

بەسەرچێ گەر حەیاتم بێ زەمستانی غەم و هیجران

دەکەم رۆژێ تەماشای باغ و گولزارم وەلێ زەحمەت

دەبوایە بیووتایە :

ئەگەر حەیاتم بەبێ زەمستانی غەم و هیجرانی بەسەر بچێ

رۆژێ تـــــەماشی باغ و گولزارم دەکەم وەلێ زەحمەت

لە هەردوو نیوە دێڕەکەدا :

(بەسەربچێ) و (دەکەم) کە کردارن و بەشی گوزارەی رستەکانن جێی بەشی نیهادیان گرتۆتەوە.

نمونە بۆ ناخۆشی وەك وتمان گەلێ زۆرە : بۆ ئەمەش ئەو رەگەزەی ناخۆشییەکە کە دەگەیەنێ پێش دەخرێ تا بە زووترین کات بیگەیەنێ.

ناکەن هەوایی هیچ کەبابێ زەلیلی شەهر

بریانە بەس لە ناری غەما پارەیی جیگەر

* * * * * * * * * * * *

سووتا دڵم بە حـاڵەتی جۆباری (سەرچنار)

لێلاوە چەشمە ساری وەکو چاوی بێ بەسەر

---

[46] بڕوانە رستەسازی لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کوردی، بەرگی چواردەهەم، ١٩٨٦، ل١٨٦، د. کوردستان، سینتاکسی رستەی سادە لە زامیەن کوردیدا، بەغدا، ١٩٨٦،ل٦٩.

گرنگترین مەبەست کە سالم لە شیعرەکانیدا ئەم پاش‌و پێشخستنەی بۆ کردبێ پتەو کردن و دروست کردنی هێز و توانا بەخشینیکە بە دێڕە شیعرەکەو ئەو تایبەتیەی لە دارشتنی وشە و رستەکاندایە جۆرە روالەتێکە تایبەتە بە شێوازی هیندیەوە، چونکە بە پاش و پێش خستن و ئالۆزکاری هێز و تینێك دەدا بە ناوەرۆکەکە بەتایبەت بە هووشەکاری و موبالەغەی زۆری تێدا بێت لە دەربڕینی غەم و پەژارەو دوورکەوتنەوە لە یار و دەرخستنی بەتوانایی و هێزی نووسین و شاکاری شیعرەکانی :

بنوسم چـــۆن لە هیجرانا بەیادی سیمبەر کاغەز
دەکا گوم دووکەڵی ئاهم لەبەر مەدی نەزەر کاغەز

پێش خستنی کاری (بنووسم) لە نیوە دێڕی یەکەمدا و کاری (دەکا گوم) بە واتای گوم دەکا کە لەم وشە لێکدراوەشدا پاش و پێشێکی تێدایە. بەمەبەستی تایبەتمەندێتی و جۆری ئەو نووسینەیە و لەلایەکی

تریشەوە گرنگی دان بە نووسینەکە[47] و دەربڕینی وشەکاری لە دووکەڵی ئاهەکەیدا:

دەکـــــا دونیای پڕ شۆڕش بـــــــــە دایم فتنەها پەیدا
بـــــە نەیڕەنگ و فسوون هەردەم لە هەر سوێی وەغا پەیدا
پەنـــــــاهم شەهسوارێکە گـــــوزەرکا گەر بە (ئەلبورزا)
دەکـــــا زەربی سمی ئـــــــــــەسپی لەخارا تووتیا پەیدا

لە نیوە دێڕی دووەمدا بە مەبەستی گرنگی دان و دەرخستنی هێزی سمی ئەسپی سوارەکەی کرداری پەیدا دەکای کردووە بە دووبەشەوە بەشێکی کە بریتیە لە (دەکا) لەبەر ئەو تایبەتیانەی کە باسمان کرد لە سەرەتای رستەکەدا لە جێگای نیهاد دایناوە.

سالم پاڵ پشت و پەناکەی کە سوارچاك و پاڵەوانی قەسیدە پاڵەوانییەکەیەتی بەکێوی ئەلبورزدا تێدەپەڕێنێ چونکە شوێنی داستان و رووداوە مێژووییەکانە. بەم شێوەیە سالم توانیویەتی سەرکەوتووانە قەسیدەی لاو چاکی و قارەمانی بنوسێ.

---

[47] بروانە : الایضاح ، ص ١١١-١١٢.

## شێوازی شیعری کوردی

دیوانە چاپکراوەکان و هەندێ لێکۆڵینەوەی زانستی لەبارەی شیعر و بەرهەمی شاعیرانەوە سەرچاوەی گەلێ بابەتی لێکۆڵینەوەو دەرخستنی لایەنی شاراوەو باس نەکراوی شاعیرانن، لەم روانگەیەوە هەوڵ و کۆششی بلاوکەرەوەکانی دیوانی شاعیرانی کلاسیکیی کورد جێگای رێز و نەوازشە. لەگەڵ ئەو هەوڵە پڕ سوودانەیاندا کە لە کۆکردنەو و بلاوکردنەوەی دیوانی شاعیران، لە پێشەکی و سەرەتای ئەم دیوانانەدا، جار جار رەخنە و دیاری کردنی لایەن و مەبەستە شیعرەکانیان باسکردووەو دیار خستنی شێوازی ئەو شاعیرانە، بەپێی سەردەم و رادەی پێشکەوتنی رۆشنبیری لە ریزی نووسین ولێکۆڵینەوەی زانستی بە نرخدایە[48].کوردیو مەریوانی لەبارەی شێوازی مسەفا بەگی کوردیەوە دەڵێ : ((شیعرەکانی بێ قۆرت و گرێیە، زۆر جوان و کوردی پەتیە، مؤثر و دڵگیرە))[49]. هەرچەندە ئەم هەڵسەنگاندنە گشتی و دەربڕینێکی سەرپێییە، بەلام تایبەتێتی و خاسیەتی شیعرەکانی (کوردی) لە سێ خاڵدا دیاری کردووە کە ئەمانەن :

١.(بێ قۆرت و گرێ) واتە رەوان و ئاسان.

٢.زۆر جوان، بەکارهێنانی هونەری جوانکاری لە رەوانبێژیدا.

٣.مؤسیر و دڵگیر، کاریگەری و دڵگیری شیعرەکان لەلای خوێنەر.

بەخوێندنەوەی چەند پارچە شیعرێکی مستەفا بەگی کوردی ئەو تایبەتی و رەگەزانەی شێوازی شیعرەکانمان بۆ دەردەکەوێ، ئێمە لێرەدا بەپێی گرنگی و ناسراوی شیعرەکانی کوردی لە گرنگترین و دیارترین رەگەزی شێوازی کوردیەوە دەدەوێین کە بریتیە لە :

---

[48] بروانە دیوانی کوردی ، کوردی و مەریوانی ، ١٩٣١، بەغدا ، سەرەتا و سەرگزشتەی کوردی ، ل أ — هـ

[49] سەرچاوەی پێشوو.

### ١. ڕوونی (الوضوح) :

ڕوونی یان ئاشکرا یەکێکە لە تایبەتیە گشتیەکانی شێوازی ئەدەبی، مەبەست لە ڕوونی ئەوەیە کە نووسەر یا شاعیر ئەو بیرەی کە دەیەوێ بیگەیەنێ لە داڕشتن و دەربڕینەکاندا هیچ ئالۆزی و گرێ لێدانێکی تیا نەبێ و بە ڕوونی بیرەکانی لە قالبی وشە و ڕستەکاندا بەئاسانی دەربڕێ و خوێنەر یا گوێگر بەئاسانی لە مەبەستی شاعیر بگات و هیچ نارەحەتی و دوولایەنی پەیدا نەکات لە ڕووی واتا و مەبەسەوە. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بەرهەمەکە لەبەر ڕوونی لاواز و بێ هێز بکرێ و هێزی شێوازەکەی کەم بکاتەوە. چونکە هێزی سۆز و هەژاندنی سۆزی خەڵکی بە شێوازێکی بەهێز نەبێ نایەتە دی، هێزی شێواز کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە وروژاندنی سۆز و عاتیفە و ڕوونی واتاکاندا[50]، لەبەر ئەمە شاعیر دەتوانێ واتاکانی بە گوێگر بگەیەنێ، بەڵام ناتوانێ هەست و سۆزی خۆی بگەیەنێ ئەگەر شێوازێکی بەهێزی نەبێ.

هەرچەندە تاکە تاکە و ناوناو لەدیوانی شاعیرانی تردا پارچە شیعرێ یان غەزەلێك بەدی دەکرێ کە ڕوونی و ئاسانی و ڕەوانی شێوازی پێوە دیاربێت، بەڵام هەرگیز لەلای هیچ شاعیرێ وەك لای کوردی نەبووە بەشێوازی سەرەکی و ئاشکراو دیار. زۆربەی زۆری غەزەل و پارچە شیعرەکانی کوردی ئەم ڕەگەزەی شێوازی تیا بەدی دەکرێ. وا لێرەدا چەند نمونەیەکی پیشان دەدەین :

چێشتم ئەمڕۆ ژەهری مار و ڕۆحی شیرینم نەهات
زەخمی کۆنەم هاتە ژان و مەرهەمی برینم نەهات

غەم سەری لێدام و یارم قەد سەرێکی لێ نەدام
ســـەبرو هۆشم ڕۆیوە غارەتکەری دینم نەهات

وەنییە کوردی مایلی ئەو نەوعە ئەتوارانەبێ
لازمـــە شاعیر لە هەر نەوعێ بڵێ بۆ ئیمتیاز

---

[50] احمد امين، النقد الادبي، بيروت، ١٩٧٦، ص ٤٨.

ڕوونی و ئاشکرا لەلای کوردی بەڕادەیەکی وا باڵی کێشاوە بەسەر شێوازی دەربڕینەکەیدا تا ئەو رادەیە هەرچی نهێنی و پەنهانیشبێ نەیویستووە حەشاریدا، هەروەك سروشت و تەبعە ئاسان و سادەکەی بەڕوونی چی لە دڵ و دەروونیدا بووبێ بەسادەیی و روونی ئەو هەست و سۆزەی خۆی بە خەڵکی گەیاندووە ولە خوێندنەوەی غەزەلەکانیدا ئەم هەست و سۆزە ناسکە لەلای خوێنەر پەیدا دەکا:

گەر دەپرسی مەنزل و شکڵ و لیباس و تایەفەی

مـــاڵیان نـــــزدیك بە بەندیخانەیە و ئاشی ئەحان

ئـــەسمەرە لاغـــەرتەنە باڵا میانە کەچ کوڵاه

سوخمە سەبزە مەیتەن ئاڵە چاو خومار ئەبرۆ کەمان

ســـــەدای کاروانی فیقەت دێ دەڵێن سەرقافڵەچی یارە

زڕەی پێشەنگی میحنەت دێ دەڵێن کـــاڵای غەمبارە

چـــــاوەکـــــەم زانیوتە بـــــۆچی خەو لەچاوم ناکەوێ

چونکە من پێش خزمەتم پێش خزمەتان نانوون شەوێ

ئەم رەگەزە واتە روونی بە بنچینەی شێواز دادەنرێ، دەبێ ماناکە بە پوختە کراوی بدا بەدەستەوە. بۆ ئەم مەبەستەش شاعیر پێویستی بە سامانێکی گەورە و دەوڵەمەندە لە فەرهەنگی زماندا، تا بتوانێ وشەی پڕ واتا و مەبەست هەڵبژێرێ. مستەفا بەگی کوردی لەگەڵ روونی و ئاشکرایی شێوازەکەیدا زمانێکی سادە و رەوان و پاراوی لە شیعرەکانیدا بەکار هێناوە. کوردی خۆی بە سوارچاك و ئازاو دلێری مەیدانی شیعر و رەوانبێژی دەزانێ و زمانی کوردی بە زمانێکی پاراو و بێ گرێ دادەنێ هەمیشە شێوازەکەی بە بروسکە و چەخماخەیەکی تیژڕەو دادەنێ بۆ تێگەیاندن و زوو حاڵی بوونی خوێنەر یا گوێگر، بۆیە دەڵێ:

(کوردی) دلێری عەرسەیی نەزم و فەساحت

جەولان دەکا هەمیشە وەکو بەرقی تیژڕەو

ئەوەی لەم تایبەتمەندیەدا دەردەکەوێ کە شێوازێکی روون ئەنجام دەدا لە رێگای بەکار هێنانی ئەو وشە و زاراوانەوەیە کە پێویستە ئاڵۆزی و لێك پچڕان و گیری تیا

نەبێ [51]، هەروەها لە شێوەی ریزکردنی وشە و رستەکاندا بەشێوەیەك بێتکە لەگەڵ رێزمانی زمانی کوردیدا بگونجێ و واتاو مەبەستەکان بەروونی بگەیەنێ. وشەو زاراوەی فەرهەنگی نامۆ و بیانی بەکەمی تیا بەکار هاتبێ [52]. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە شاعیر بۆ بەدیهێنانی شێوازێکی روون و ئاشکرا وشەی سادە و قسەی ژیانی رۆژانە ریز بکات و لایەنە هونەریەکانی ئەدەب پشت گوێ بخات بەڵکو بەپێچەوانەوە، شاعیری سەرکەوتوو خاوەن شێوازی روون و سادە و ئاسان لەگەڵ بەکارهێنانی وشە و زاراوەی ئاسان و رەواندا بە دارشتنێکی ئاسان و رازاوە بەهونەری جوانکاریەوە بەشێوازێك شیعرەکەی پێشکەش دەکا کە تایبەتی بێ بەشێوازی خۆیەوە لەگەڵ ئەو سادەیی و ئاسانییەشدا بۆ هەموو شاعیر و نووسەرێك نالوێ و دەست نادا. لە ئەدەبی عەرەبیدا ئەم جۆرە دەوترێ (سهل ممتنع) وەك بەرهەم نووسینەکانی تەها حوسێن کە بە سەهلی مومتەنیع ناسراوە.

هەروەك لە شیعرەکانی کوردیدا بۆمان دەردەکەوێ بە شارەزاییەوە وشەی و ئەدەبی و پاراوی پڕ واتای ناو خەڵکەکەی هەڵبژاردووە. بۆ نمونە سەیری وشەی (زوخاڵ)دەکەی کە هاوتای (سینۆنیم)ی وشەی خەڵووزە لەم دێڕە شیعرەدا :

تاکەی ئەم جەور و جەفایەت چاو خوماری سوخمە ئاڵ
دڵ لە هەجر و فیرقەتت سووتاو، رەش بوو وەك زوخاڵ

لەناو خەڵکیدا (خەڵووزە) کە باوو گشتیە، هەرچی وشەی (زوخاڵ)ە تایبەتە بە فۆلکلۆرو بەیتە ئەدەبیەکانەوە و بۆ دوعا و نزا نەبێ بەکار نایەت، جگە لەوەی بۆ پارسەنگ و جووت بوونی قافیەش ئەم وشەیەی زۆر بەجوانی هێناوەتە ناو دێڕە شیعرەکەیەوە :

کـــە من رۆیم جەهەنم پڕ مەکەن لێم
لە من خاڵی مەکەن کۆشك و سەراتان
گەر مەخەییر بم لە مابێنی بەهەشت و وەسڵی تۆ
وەسڵی تۆ بۆ من جەهەنم پڕ لە جەننەت نامەوێ

---

[51] الدکتور محمد غنیمی هلال، النقد الادبی الحدیث، بیروت، ١٩٧٣، ص ١١٩.

[52] سەرچاوەی پێشوو ، ص١١٩.

مەڵێن کەڵکی نەبوو رۆیی جەهەنم
ســـــــەرم قەڵغانە بۆ تیری قەزاتان

کوردی لە بەکارهێنانی (جەهەنم پڕ)دا دەیەوێ ئەم ئیدیۆمەی زمانی کوردی کە لەناو خەڵکدا باوە لە دارشتنی ئەدەبیدا بەکاربێنێ، ئەم ئیدیۆمە لەناو خەڵکدا لەکاتی تورە بوون و وەڵامێکی ناخۆش دا بەکار دەهێنرێ وەك جنێو، بەڵام نەنیا بەڕواڵەت جنێوەو بەناوەرۆك جنێو نییە وەك ئەوە یەکێك بە یەکێکی تر دەڵێ دەبرۆ بێ قەزابی، یان (بێ بەڵا بی ئەمەت بۆچی کرد). ئەم جەهەننم پڕەش بەو واتایە دێ کە یەکێ بە یەکێکی تر دەڵێ : دە برۆ جەهەنەمت لێ پڕ واتای ئەوەیە جەهەنەم پڕ بووبێ و جێگای تۆی تیا نەبێتەوە، هەرچەندە ئەو کەسەش کە قسە ئەکا لەکاتێکی تورەیی دا و بۆ ئەوە ئەیلێ گوایە جنێوی ئەداتێ کەچی لە هەقیقەتیشدا قسەکە لە مەبەستی هەردوو لایاندا دوورە[53].

لەدێڕی : (مەڵێن کەڵکی نەبوو رۆیی جەهەنم)دا، ئیدیۆمی جەهەنم بەواتای قیروسیا، چش بەکار هاتووە کە لە قسەکردندا لە پاشملە یەکێك باسی رۆیشتن یان مردنی کەسێ دەکا یان دەربڕینی بێزاری و رقە لە شتێك[54] دەڵێن رۆیشت بە جەهەنەم یان قیروسیا.

وشە کەرەسەی خاوی دەربڕینەو کاریگەریەکی گەورە و مەزنی هەیە لە بنیاتی شیعردا. لە شیعرەکانی مستەفا بەگی کوردیدا دەتوانین شێوازێك دیاری بکەین لە مەڕ ئەو وشانەی کە (کوردی) هەڵیبژاردوون و لەلای ئەو ئاشنان، دەبیین لە رووی کورتی و درێژییانەوە وشە و زاراوەیەکی هەڵبژاردووە کە کورت و کەم برگە و سووك و بەگوێ ئاشنان. بەشێوەیەکی گشتی دەبینین هەرچی وشە درێژەکانە لەبەر ئەوەی ئەو تایبەتی و خاسیەتانەیان تیا نییە کە لە وشە کورتەکاندا هەیە کەمتر لەگەڵ شیعردا دەگونجێن[55]، بەتایبەت شیعرەکانی مستەفا بەگی کوردی کە بە روونی و ئاسانیو رەوانی ناوبانگی دەرکردووە و بۆتە شێوازێکی تایبەت بۆ دیوانە شیعرییەکەی.

---

[53] عەلائەددین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، ل ٣٣٨.

[54] جەلال محمود عەلی، ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، زنجیرەی کەلەپوور/١، بەغدا، ١٩٨٢، ل١٤٧.

[55] احمد این، النقد الادبی، ١-٢ن بیروت، ١٩٦٧، ص١٢٥.

لەو شیعرانەدا کە خاوەنەکەی بە مەبەستی رازاندنەوەو جوانکاری رواڵەتی شیعرەکەبێ (فەخامە)ی شیعرەکە مەبەست بێ ئەم جۆرە شیعرانە پێویستی بە وشەی درێژ و قەبە و گرانە. هەرچی شێوازی شکۆمەندی و بڵندیە پێوەندی بە ناوەرۆکی گەورە و مەزنەوەیە ئەمەش بە وشەی کورت دێتە ئەنجام.

## کورتبڕی

لەرێگای هەڵبژاردنی وشەی کورت و پڕ واتاوە شاعیری خاوەن شێوازی روون و سادە، پەنا دەباتە بەر هونەرێکی تری رەوانبێژی کە ئەویش کورتبڕییە. کورتبڕی لە رەوانبێژیدا ئەوەیە کە مانای زۆر بە وشەی کەم دەربڕێ، واتە ئەگەر مانا و وشەکان بەرامبەر بکرێن وشەکان لە ماناکە کەمتر بن و تەرازووەکە بەلای ماناکەدابێ،

کورتبڕیش دوو جۆری هەیە:

**١.کورتبڕی بەبێ لابردنی هیچ وشەیەك :**

کــــێ دەڵێ دلبەر بەخیلن ئەمڕۆ ئەڵڵا دلبەرم
بەردی ژێر پای خۆشی هەتا هەر دەهاوێ بۆ سەرم

لەو دێڕە شیعرەدا هیچ وشەیەکی لانەبراوەو لەرووی رێزمانەوە پێکهاتووە لە رستەیەکی لێکدراون هەرچەندە رستەیەکە و هیچ وشەیەکی لی لانەبراوە، بەڵام گەر لێی ورد بینەوە دەبینین هەر رستەیە و مانایەکی قووڵ و فراوانتر لەوە هەڵدەگرێ کە تەنیا وشەکان پیشانی دەدەن.

٢. کورتبڕی بەلابردن : ئەمەش بەلابردنی وشەیەك یان زیاتر لە رستەکە لابرابێ لابردنەکەش نابێ کار لە ماناکان بکەن. ئەگەر کاری تێ بکات نابێ بە کورتبڕی. ئەو وشانەش (کە لە رستەکەدا لادەبرێ دەشێ ئامرازێك یا ناوێك یا سیفەتێك یا چەند وشەیەك بێ . . . هتد[56]

عـــەرەب ئەندامی و فارس کەلام و تورك رەفتاری
نیکاه ئاهووڕەوت کەبکی زمان تووتی خۆش ئەلحانی

---

[56] رەوانبێژی، بەرگی سێ، ل٧١.

کوردی لەم دێڕە شیعرەدا ، لە هەر نیوە دێڕێکا سێ لێکچواندنی هێناوە لە هەموویاندا ئامراز (ئەوزار) ی لێکچواندنەکەی فڕێ داوە کە بریتیە لە (وەکو). جگە لەمە لە هەریەکێك لە لێکچواندنانەدا وشەیەکی لابردووە. کە مەبەستی وەسف کراوەکە دەگەینێ. کە دەڵێ (عەرەب ئەندامی) مەبەستی ئەوەیە بڵێ ئەندامت وەکو ئەندامی عەرەب وایە. ئەندامی عەرەبیش زبر و رەنگ ئەسمەرە. لێرەدا ئەو ئاوەڵناوەشی لابردووە، دەبێ خوێنەر بە وردی لە واتاکانی بگات.

هەروەها ئەو ناوی بکەرەش لەجێی ئاوەڵناودایە و مەبەستی ئەوەیە بڵێ قسەخۆش و شیرین کەلامن. لە لێکچواندنی سێیەمدا (تورك رەفتاری) واتە کردەوەو رەوشتت وەك تورکان وایە، ئەمیش بەواتای خۆشەویست و جوان و شەڕانی و بزێو و عەجول دێ. کوردی بۆ ئەوەی دووبارە کردنەوەی زۆر لە دیوانەکەیدا نەبێ پەنای بردۆتە بەر هەڵبژاردنی وشە و ئەم شێوازەی بەکار هێناوە جگە لەوەی گەلێ هونەری تری رەوانبێژی بەکار هێناوە بۆ ئەوەی لە وەسف و دەربڕینی خوورەوشتی یارەکەیدا دوبارەبوونەوەی تیا نەبێ.

# وشه و زاراوه و لێکسیکۆن

له لێکۆڵینەو و شیکردنەوەی شێوازگەریدا گرنگی تەواو بە وشەو چۆنییەتی دارشتنی وشەکان دەدرێ بەهۆی هەڵسوکەوتی شاعیرەوە لەگەڵ وشەکان و چۆنییەتی ریز کردن و سەرکێشی جۆره بەکارهێنانێکی دیاری کراو لەلای شاعیرێك دەبێتە شێوازێکی تایبەت و دیاری ئەو شاعیرە. ئەگەر چاوێك بگێڕین بە زۆربەی پارچە شیعر و غەزەلەکانی مستەفا بەگی کوردیدا، دەبینین سەردێڕی زۆربەیان بە قسەکردن لەگەڵ بەرامبەردا دەست پێ دەکات. یان راستر بڵێین کوردی لە شیعرەکانیدا رووی دەمی دەکاتە دلّدارەکەی، یان خەڵکی بەگشتی، واتە ئەو خەڵك و کەسانەی کە بە کوردی ئاشنان و گوێ بۆ شیعرەکانی شل دەکەن. دەتوانین بڵێین کوردی شێوازی (دواندن)ی هەیە لە شیعرەکانیدا روو بە روو راستەوخۆ بەرامبەرەکەر دەدوێنێ لەوانە راستەوخۆ بەرمبەر بە خۆشەویستەکەی جارجاریش مەبەستی خۆشەویستان و خەڵکیە کە لەرێی ئەوانیشەوە دیسانەوە مەبەستی هەر خۆشەویستەکەیەتی، ئەم نمونانە بەڵگەی ئەو بۆچوونانەن:

چـــاوی مەستت وا دیـــارە فیتنەیێ بەرپا دەکا
خوانی دین وەك تورکی یەغمایی بەتاو یەغما دەکا

❊❊❊❊❊❊❊❊

خۆشم قوربان بە بەندیخانە و زنجیر و سێدارەت
بشرط آنکه نیاری برسر مـــــن طعن اغیارت

❊❊❊❊❊❊❊❊❊

جانا وەرە ئەم جەژنە بـــەقوربانی سەرت بم
بۆ تیری قەزای چاوی حەسوودان سوپەرت بم

❊❊❊❊❊❊❊❊

عەزیزم نووری عەینەینم حەبیبم

سەبووری بەخشی جانان شەکیبم

عەزیزم وا لـــە دووریت دڵ فیگارم

کە خوێن دەڕژێ لە دیدەی ئەشکبارم

* * * * * * * * *

ئـــەی دوری تاجی سەری شاهانی ئیقلیمی جیهان

شەمسی ئەفلاکی کمال و شەمعی بەزمی عاریفان

* * * * * * * * * * *

چاوەکەم خۆ من بریندارى خەدەنگی چاوی تۆم

زار و بـــیمار و گرفتاری کەمەند و داوی تۆم

* * * * * * * * * *

چـــاوەکەم دەرهەق بە من بەقسەی بەدی بێ پیر مەکە

بێ خەتـــاو سوچ و قەباحەت خۆت لە من دڵگیر مەکە

* * * * * * * * * * *

چـــــاوەکـــــەم زانیوتە بۆچی خەو لەچاوم ناکەوێ

چونکە من پێش خزمەتم پێش خزمەتان نانوون شەوێ

* * * * * * * * * * * * *

چاوەکەم بۆچی لەگەڵ عاشق ئەمەندە دەعوا دەکەی

چونکە مـــەعشوقی بەقوربان عاشقت رسوا دەکەی

ئەمەش چەند نمونەیەکن کە ئەوانەی کوردی دەیاندوێنێ واتە موخاتەبی کۆن و بەکۆمەڵ رووی قسەیان تێ دەکا.

عــــەزیزان من ئەوا رۆیم لەلاتان

لە مەزڵومان بەلا چۆڵ بێ وولاتان

* * * * * * * * * * *

ئەرێ یاران شەوی هیجرانە یاخو مەحشەرە ئەمشەو

سـەدای عەباسە یا نالە و فیغانی ئەسغەرە ئەمشەو

عــەزیزان من ئەسیری قامەتی نەوتول نەمامێکم
غولامی زولف و ئەگریجە و غولامانەی غولامێکم

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

خــەبەرێکم بدەنێ ئەهلی خەبەر حەشرە مەگەر
ڕۆژ کەوا ئەمڕۆ لە مەغرب سەری هێناوەتە دەر

نزیکترین وشە کە لە دەروونی کوردیەوە هەڵقوڵابێ و هەمیشە ئاشنای زمانە پاراوەکەی بووبێ، ئەو وشانەن کە دەتوانن مانای خۆشەویستی و جوانی یارەکەی بگەیەنن. ناسکترینیان چاوی کوردیە بۆیە زۆربەی سەر دێڕەکانی بە چاوەکەم دەست پێ دەکا، ئینجا خۆشەویست کە وشەی (عەزیز)ی عەرەبی لەسەر زمانی زۆر بە شیرینی هاتووە و ناوی یارەکەی پێ بردووە.

لە وەسیەت نامەکەشیدا ڕووی دەمی دەکاتە نەتەوەکەی و دەڵێ :

عەزیزان من ئەوا ڕۆیم لەلاتان

سەرجەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە وەك لە پێناسەی شێوازیشدا هاتووە ئەوە دەردەخا کە شێواز بریتیە (لە کۆمەڵێ دووبارە بوونەوە و جیاوازی تایبەت بە دەقێکەوە یا بەهەمێکی دیاریکراو)[57] بەگوێرەی ئەم ڕاستیە وشەی چاو و عەزیز سەردەستەی ئەم کۆمەڵە وشە و زاراوانەن لە فەرهەنگی شیعری (کوردیدا) عەشق و یار و ویساڵ، لەیلی بێ مەیل و تورك ڕەفتار و ئەسمەر و لاغرتەن و سوخمە سەوز و ئاڵ. چاوی بە خومار، سەدا و زەنگی قافڵەو کاروانی قادر، دڵو دیدەی پڕ لە خوێن و جگەری کون کون و دڵی بە خەنجەری تیژی موژەی مەحبوبە عەیارەکەی پارچە پارچە کراو. ڕۆژ و شەو دووڕ و یاقووت دەبارێ لە کەلام و گوفتارە شیرینەکەی کوردی و شەوی یەڵدا و دەیجوورقەت غافڵ نەدەبوو لە زیکری قادری.

بەم شێوەیە ئەو کۆمەڵە وشە و زاراوانە و هەندێکی تر لەو وشانەن کە مۆرك و تایبەتێتی کوریان پێوە دیارە، هەروەك هەموو شاعیرێکی تر کۆمەڵە وشە و زاراوایەکی دیاریکراو لە بەرهەمەکانیدا دووبارە دەبێتەوە.

---

[57] د.جوزيف ميشان شريم، دليل الدراسات لاسلوبية، بيروت،١٩٨٤، ص٣٧.

دیاردەیەکی تری زمانی شیعری مستەفا بەگی کوردی ئەوەیە، کە بەهۆی ئەوەی زۆرەبەی زۆری شیعرەکان لە بابەتی غەزەلن و وەسف و پیاهەڵدانی یار و خۆشەویست مەبەستی سەرەکی شیعرەکانە، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی کە زمانی شیعرەکانی کوردی تایبەتیەکی هەبێ لە بەکارهێنانی ئاوەڵناوەکاندا. لەبەر ئەمە دەبینین زۆری بەکارهێنانی ئاوەڵناو لە دێڕە شیعرەکانیدا بۆتە شێوازێکی تایبەت بەم جۆرە شیعرانەی کوردیەوە کە لەبابەتی شیعری گۆرانی (لیریك) دان. ئەمەش لە راستیدا دەمانبات بۆ مەغزاو جەوهەری شێواز وەك بیسلی دەڵێ (شێواز رێگایەکە لە راستەڕێ و باوو دەردەچێ، لەبەر ئەمە بەکارهێنانی زمان بەم شێوەیە بە بەکارهێنانێکی شێوازگەریانە دەژمێردرێت. بۆنمونە بەکارهێنانی ئاوەڵناوەکان بەکارهێنانێکی شێوزگەریانە دەبێ. ئەگەر هاتوو بەزۆری بەکارهێنران و زیادە رۆییان لە بەکارهێنانیدا کرد)[58].

ئەگەر سەرنجی ئەم پارچە غەزەلە بدەین دەبینین ئاوەڵناوەکان کەرەستەی سەرەکی و زۆربەن لەچاو وشەکانی تردا :

لـــەیلەکـــــەی بێ مەیلەکەی مەحبوبەکەی عەیارەکەم
شـــۆخەکەی بەدبەختـــەکەی بێ رەحمەکەی غەدارەکەم
زاڵــــمـــــەی لـــــە خوا نەترسەی کافرەی بێ مروەتە
قـــــاتـــڵـــەی عاشق کوژەی جەللادەکەی خونخوارەکەم
گـــــوڵ بەدەن سیمین زەقەن خەت یاسەمەن فندق دەهەن
ئـــەسمـــــەرەی قەد عەرعەرەی ناز و نەزاکەت دارەکەم
نـــــــەوجـــوان ئـــەبرۆ کەمان شیرین دهان و نوکتەدان
تـــــــورك رەفتار و پـــەری روخسار و کاکۆڵ دارەکـــــەم

کەرەسەی سەرەکی ئەو شیعرە بریتیە لە ئاوەڵناو، هەندێ وشەی تر دەبینین ناون یان ناوی بکەرن (اسم فاعیل) بەڵام لەواتای شیعرەکەدا لە سیمانتێك دا ئەوانیش لەبەر ئەوەی شێوەو سیفات و رەوشتی یارەکەی پیشان دەدەن ئەوانیش ئاوەڵناون. ئەوەی

---

[58] رولف ساندل، مفهوم الاسلوب، ترجمة لماء عبدالحميد، الثقافة الاجنبية، العدد الاول، السنة الثانيية، ١٩٨٢، ص٧٦.

سەرنج ڕاکێشە لەو پارچە شیعرەدا کاری بەدەگمەن تیادا بەکار هاتووە ئەو کارانەش کە بەکار هێنراون بێ هێزن.

وەك لە پێشتر وتمان شێوازێکی کوردی ئەوەیە ڕاستەخۆ ڕوودەکاتە خۆشەویستەکەی و دەیدوێنێ. ئەگەر سەرنجێکی چۆنییەتی داڕشتنی ئامرازەکان بدەین لەم ڕووەوە دەبینین لە دێڕی یەکەم دا نیشانەی ناسراوی(ەکە) و ئامرازی خستنەسەری (ی) (ئیزافەی) لەسەر ناو و ئاوەڵناوەکان داناوە، لە دێڕی دووەمدا نیشانە ناسیاریەکەی لابردووە، لە دێڕی سێیەمەوە ئامرازی خستنە سەرەکەشی فڕێداوە بە تەنیا ئاوەڵناوەکانی بەشێوەیەك ڕیز کردووە کە نزیکی و گونجان و هاودەنگیەکی تەواو لە نێوان دەرخەر و دەرخراوەکاندا هەیە.

ئەم جۆرە داڕشتن و هەڵبژاردنی وشەیە لەلای کوردی یەکێکە لە ڕەگەزە جوانکاریەکانی شێواز، ڕەگەزێکی دیکەی جوانکاری لەو پارچە شیعرەدا بریتیە لە مۆسیقا ئەو وشەو زاراوانەی کە کوردی دایڕشتوون لە دووتوێی شیعرەکاندا جۆرە مۆسیقاو ئاوازێکی چون یەکیان هەیە و هاوسەنگیەك لەنێوان بڕگە و پارچەکانی وشەکاندا بەدی دەکرێ و زۆر بەئاسانی دەتوانرێ بڕگە بڕگە بکرێن، لە کۆتایی هەر بڕگە و پارچەیەکدا مۆسیقا و ئاوازێکی تایبەت بەدی دەکرێ کە لەئەنجامی ئەو دەنگانەوەیە کەوەك قافیە لە کۆتایە وشە و زاراوەکاندا هەر وشەیەك لەگەڵ ئەوی دیکەی پاش یان پێش خۆیدا قافیەیان دروست کردووە بەمەش ڕەگەزێکی تری جوانکاری شێوازی لەم پارچە شیعرەدا زیاد کردووە کە ئەویش ڕەگەزی (ڕەوعەیە) قەشەنگی و کۆکیەك دەبەخشێ بە شیعرەکان. ئەم لایەنە جوانکاریان لە شێوازی کوردیدا دەبێتە تەواوکەری ڕەگەزە جوانکاریەکان چونکە وەك هۆراس دەڵێ (( تەنیا جوانی قەسیدە بەس نییە، بەڵکو دەبێ سیحرێکی هەبێ کە هەر کاتێ ویستی هەستی گوێگر بۆلای خۆی رابکێشێ. ئادەمیزاد بە تەبیعەت دڵی بە ڕووی دەم بە پێکەنین دەکرێتەوە، هەروەها بە دەنگی گریان دڵ تەنگ دەبێ))[59]. شاعیر بەتەنیا بیر دەرنابڕێ . . بەڵکو هەست و سۆزی ناسك و کایگەر بەشێوازێك دەردەبڕێ کە بەهۆیەوە خوێنەر دەهەژێنێ و هەست و سۆزیان بەرەو سۆزی خۆی ڕادەکێشێ. ئەم ڕەگەزە جوانکاریانە

---

[59] هۆراس، هونەری شیعرن حمیدعەزیز کردوویەتی بە کوردی، بەغدا، ١٩٧٩،ل٢٠.

شێوازیان پێ جوان و شیرین و دڵگیر دەکرێ. ئەم مەبەستە لەم پارچە شیعرە پڕ سۆز و جوانکاریەدا بەدی دەکرێ کە سەرنجی زۆربەی زۆری شاعیرانیشی راکێشاوە و هەست سۆزیان تێکەڵ بە هەست و سۆزی کوردی کردووە لە رێگەی بە پێنج خشتەکی کردنی ئەم غەزەلەوە :

ئـەمـان مـردن عـیلاجـێ سا لە رێـی پێغەمبەرا چـارێ
ویـسالْ یـا قـەتلْ یا تەسکین لە هەر سێ بۆم بکەن چارێ
وەهـــــا سووتاوم ئـەسڵەن تـابی فریـادم نەما سـا دەی
رەفـیقـــان نـیوە سـووتـوون ئێوە نـامـەرد عەرزە هاوارێ
**********************
لـە کـونجی سینە دەنـگی ئای و ئـۆی دڵ دێ بە مەحزونی
وێـــــران بێ نـەم دی سـاتێ لێی نـەیـە نـاڵـەی برینداری
بـۆلای هـەرکەس دەچـم مەنعم دەکا خۆت بۆچی رسوا کرد
درێـغ کــــوا حـاڵ زانێ رەبی تـووشم بێنی بیمـــاری

تا لەکۆتاییدا نرخی شیعرەکەی خۆی دەزانێ و لە دنیادا کەس کڕیار و نرخزانی نییە :

دوڕ و یاقوت ئەبارێ لەم کەلامە شیرینەی کوردی
خـــوا ســا کـوا لـــــە دنیادا قەدرزان و خریدارێ

جوانی و ناشرینی هونەرێك لە پێوەندی نێوان بەشەکانی ئەو هونەرەدا دەردەکەوێ و پێوەندی تاکە بەشەکانە بە هەموو پارچە هونەریەکەوە. لە غەزەل یا قەسیدەیەکدا لایەنە جوانکاریەکان لە سەرانسەری پارچە غەزەلەکەدا دەردەکەوێ جگە لەوەی لە بەش و نیوە دێڕەکانیشدا خۆیان دەنوێنن، بەڵام بەتەنیا لە وشەیەك یا زاراوەیەکدا خۆی حەشار نادا لەبەر ئەمە بەلای هربارت ەوە ((بەشەکانی مۆرفۆلۆجی بەتەنیا و تاکە تاکە جێگای ئەوە نین جوانیان تێدا دیاری بکرێ، تاوەکو پێوەندی لە نێوانیاندا دروست نەبێ))[60]، ئەم رەگەز و تایبەتیە جوانکاریانە کە بریتین لە (مۆسیقا، جوانی و بەرزی، جۆرە ئەفسونێکی تێدایە کە سەرنجی خوێنەر رادەکێشێ بەمەش لایەنەکانی شێوازی

[60] الدکتور عزالدین اسماعیل، الاسس الجمالیة فی النقد العربی، القاهرة، ط الثانیة، ١٩٦٨، ص ٢٣٤.

تەواو کردووە بەبێ ئەوەی زەحمەت و ناوێزەیی و ئاڵۆزی تێدابێ بەواتایەکی تر بە سوك و سانایی بەرهەمێکی جوان و دڵگیر و پڕسۆزی پێشکەش کردووین. ئەم جۆرە شێوازە لە شیعرەکانی کوردیدا جگە خۆشی و تام و بۆو رەوان و ئاسانییەکەی کە خوێنەر هەستی پێ دەکاو خۆشی دەبەخشێ، توانا و دەسەڵات و کارامەیی کوردیش دەردەخا لە بەکارهێنانی ئەو جۆرە هونەرانەدا کە لە ئەنجامدا دەبنە هۆی ئەوەی شقڵێکی تایبەت بدەن بە شیعرەکانی و شێوازی تایبەتیەکەی پێ دیاری بکات.

# سەرچاوەکان

**کوردییەکان :**


- ئەحمەدی خانی، نوبهارا سیدایی مەزن ئەحمەدی خانی، صادق بهاء الدین، بەغدا،١٩٧٩.
- ئەمین فیضی بەگ، ئەنجومەنی ئەدەبیات، توێژینەوەی لیژنەی وێژەو کەلەپور، کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٣.
- تۆفیق قەفتان، مێژووی حوکمدارانی بابان لە قەڵاچوالان، بەغدا، ١٩٦١.
- جەلال مەحمود عەلی، ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، زنجیرەی کەلەپور -١- بەغداد، ١٩٨٢.
- جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، یامبرگ، ١٩٧٦.
- خانای قوبادی، شیرین و خوسرەو، ساغکردنەوەی محمدی مەلا کەریم، بەغدا، ١٩٧٥.
- دڵشاد عەلی محەمەد، بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٨٩.
- دیوانی ئەدەب، یادگاری عبدالله بەگی مصباح الدیوان، چاپی سێیەم، هەولێر، ١٩٦٦.
- دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی سەردار حەمید میران، کەریم مستەفا شارەزا، پێداچوونەوەی مسعود محمد، ١٩٨٦.
- دیوانی حەریق، کتێبخانەی مەریوانی، ژمارە ٦ ، بغداد، ١٩٣٨.
- دیوانی سالم، کوردی و مەریوانی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٣٣.
- دیوانی سید یعقوب ماهیدەشتی، هەوڵ و کۆششی محمد علی سلطانی، ١٣٦٣ه.
- دیوانی کوردی، کوردی مەریوانی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٣١.
- دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی.
- دیوانی مەحوی، لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و محمد مەلا کریم، بەغدا، ١٩٧٧.
- دیوانی نالی، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم، بەغدا، ١٩٧٦.
- دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، لێکۆڵینەوەو ساغ کردنەوەی د.مارف خەزنەدار، بەغدا، ١٩٧٧.
- دیوانی وەفایی، لێکۆڵینەوەی محمد عەلی قەرەداغی، بەغدا، ١٩٨٦.
- رەمزی قەزاز، داستانی دوو پاڵەوان، فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە و کەیغانی فەرەنگ، مطبعة الجاحظ، بەغداد، ١٩٦٨.
- رەفیق حیلمی، شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٨٨.
- سەرەتایەك بۆ لێکۆڵینەوەی شیعری کلاسیکیی کوردی، چەند وتارێکە لە دیداری شیعری کلاسیکیی کوردیدا خوێندراوەتەوە، ئامادەکردنی بۆ چاپ حمە کریم، بغداد، ١٩٨٦.

○ شەرەف خانی بدلیسی، شەرەفنامە، گۆڕینی هەژار، بەغدا، ١٩٧٣.
○ عەلائەددین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەغداد، چاپی دووەم، ١٩٧١.
○ عەلائەددین سجادی، نرخ شناسی، بەغداد، ١٩٧٠.
○ عەلائەددین سجادی، خۆشخوانی، بەغداد، ١٩٧٨.
○ عەلائەددین سجادی، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، بەغداد، ١٩٧٨.
○ د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، سەرنجی لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، بەغدا، ١٩٧١.
○ د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، شیعری کوردی، ژیان و بەرهەمی شاعیرانی، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٠.
○ عەزیز گەردی، رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی یەکەم، رونبێژی، بەغد، ١٩٧٢.
○ عەزیز گەردی، رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی دووەم، جوانکاری، هەولێر، ١٩٧٥.
○ عەزیز گەردی، رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی سێیەم، واتا ناسی، سلێمانی، ١٩٧٩.
○ عەزیز گەردی، پەخشانی کوردی، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٧، کتێبێکی مەنهەجیە.
○ عبدللا بەگی مسباح — دیوان، شاعیری گەورەی خاکی موکریان، لێکۆڵینەوەو بلاوکردنەوە، نووسینی دکتۆر مارف خەزنەدار،بەغدا، ١٩٧٠.
○ د. کامل حسن البصیر، شێخ نوری شێخ صالح لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی وێژەیی و رەخنەسازیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری، بەغدا، ١٩٨٠.
○ د. کوردستان موکریانی، سینتاکسی رستەی سادە لە زمانی کوردیدا، بەغداد، ١٩٨٦.
○ کەریم شارەزا، نالی و زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، بەغداد، ١٩٨٤.
○ د. مارف خەزنەدار ، کێش و قافیە لە زمانی کوردیدا، بغداد، ١٩٦٢.
○ د. مارف خەزنەدار، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردیەوە، بەغدا، ١٩٨٤.
○ محمد ئەمین زکی، تأریخ سلێمانی و ولاتی، بەغدا، ١٩٣٩.
○ محمد معروف فتاح، زمانەوانی، جامعە صلاح الدین، هەولێر، ١٩٨٧، کتێبێکی مەنهەجیە.
○ محمد ملا کریم، نالی لە کلاورۆژنەی شیعرەکانییەوە، بەغداد، ١٩٧٩.
○ مەسعود محمد، چەپکێك لە گوڵزاری نالی، بەغدا، ١٩٧٦.
○ هۆراس، هونەری شیعر، حمید عزیز کردوویەتی بە کوردی، بەغدا، ١٩٧٩.

## گۆڤار و رۆژنامەکان :


- گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ۱۹۷۳.
- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کوردی، بەرگی هەشتەم، ۱۹۸۱.
- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کوردی، بەرگی نۆهەم، ۱۹۸۲.
- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کوردی، بەرگی سیانزە، ۱۹۸۵.
- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کوردی، بەرگی چواردەهەم، ۱۹۸٦.
- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کوردی، بەرگی شانزە و حەڤدە، ۱۹۸۷.
- گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ، ژمارە ٦۰، نیسان و مایسی ۱۹۷۷.
- گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ۱۰۷، ئەیلولی ۱۹۸۵.
- گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ۱۱۲، کانونی یەکەم، ۱۹۸٦.
- گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ۱۱۳، ئاداری ۱۹۸۷.
- گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، زانستگای بەغدا، ژ. ۱۵، بەغدا، ۱۹۷۲.
- گۆڤاری ((شمس کوردستان)) رۆژی کوردستان، العدد ٥،٦ / ت۱، ۱۹۷۱.
- گۆڤاری کاروان، ژمارە ٦۷، ئابی ۱۹۸۸.
- گۆڤاری بەیان، ژمارە ٤۷، شوباتی ۱۹۷۸.
- رۆژنامەی ژیان، ژمارە ۲۷، ۳۱، ۳۲، ۳۹، ٤۰، ٤۱، ٤۲، ٤۳، ٤٦، ٥۹.
- رۆژنامەی ژیان، ژمارە ۲۹۳، ۱٤/ئەیلول، ۱۹۳۱.
- برایەتی، ژمارە ۱۰ ، ساڵی یەکەم خولی دووەم، کانوونی دووەم ۱۹۷۱.
- برایەتی، ژمارە ۱، ساڵی دووەم، خوولی دووەم، حزیرانی ۱۹۷۱.


## عەرەبییەکان :


- ابن خلدون، المقدمة، مصر، مطبعة خيرية العامرة، ۱۳۲۲ ه.
- ابن القاسم اسماعيل بن عباد، الاقناع فی العروض و تخريج القوافی، تحقيق الشيخ محمد حسين آل ياسين، بغداد، ۱۹٦۰.
- احمد أمين، النقد الادبی، لبنان، ۱۹٦۷.
- احمد شايب، الاسلوب، مصر، الطبعة السادسة، ۱۹٦٦.
- الاحمدی فی ترجمة الكلمات العربية بالكردية، دراسة و تحقيق مجموعة من اوقاف السليمانية، بغداد، ۱۹۸٤.
- د. احمد مطلوب، البحث البلاغی عند العرب، الموسوعة الصغيرة، عدد ۱۱٦، بغداد، ۱۹۸۲.

- أ.ف. تشتشرين، الافكار و الاسلوب، ترجمة د. حياة شارارة، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد.
- الشيخ جلال الحنفي، العروض التهذيبي و اعادة تدوينة، بغداد، ١٩٧٨.
- جلال الدين محمد، خطيب القزوينى، الايضاح فى علوم البلاغة، الجزء الثاني، القاهرة.
- د. جوزيف ميشال شريم، دليل الدراسات الاسلوبية، بيروت، ١٩٨٤.
- داود سلوم، تطور الفكرة و الاسلوب فى الادب العراقي، بغداد، ١٩٥٩.
- رشيد احمد التركى، فلوبير نظرة فى اسلوبه الفنى، الموسوعة الصغيرة، ١٣٢، بغداد، ١٩٨٣.
- روجر فاولر، نظرية اللسانيات و دراسة الادب، ترجمة د.سلمان الواسطى، مجلة الثقافة الاجنبية العدد الاول، السنة الثانيية، ١٩٨٢.
- رولف ساندل، مفهوم الاسلوب، ترجمة لميأ عبد الحميد العانى، مجلة الثقافة الاجنبية، العدد الاول، السنة الثانيية، ١٩٨٢.
- المستر ستيفن شيمسلي لونكريك، أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث، ترجمة جعفر الخياط، الطبعة الرابعة، بغداد، ١٩٦٨.
- سلامة موسى، الادب الشعبى، قاهرة.
- د. صفاء خلوصى، فن التقطيع الشعرى و القافية، التقطيع، ج/١، بغداد، ١٩٦٣.
- عبدالقهار الجرجانى، دلائل الاعجاز، بيروت، دارالمعرفة للطباعة، ١٩٧٨.
- عبد السلام المسدى، المقاييسس الاسلوبية فى نقد الادبى من خلال (البيان و التبين) للجاحظ، حوليات الجامعة التونسية، العدد١٣، العام ١٩٧٦.
- عبد السلام المسدى، السلوبية و النقد الادبى، مجلة الثقافة الاجنبية، العدد الاول، السنة الثانيية، ١٩٨٢.
- على الجندى، فن التشبيه، بلاغة، أدب، نقد، الطبعة الاولى، مصر، ١٩٥٢.
- الدكتور عبد العزيز سليمان نوار، تأريخ العراق الحديث، قاهرة، ١٩٦٨.
- طراهم هاف، الاسلوب الاسلوبية، ترجمة كاظم سعد الدين، دار آفاق عربية، بغداد، ١٩٨٥.
- الدكتور غزالدين اسماعيل، الاسس الجمالية فى النقد العربى، القاهرة، الطبعة الثانيية، ١٩٦٨.
- طوستاف فون غرنباوم، دراسات فى الادب العربى، ترجمة الدكتور احسان عباس، د. أنيس فريحة، د. محمد يوسف نجم، د.كمال يازجى، بيروت، ١٩٥٩.
- الشيخ محمد خال، الشيخ معروف النودهي البرزنجى، جزء / ١، بغداد، ١٩٦٣.
- محمد القزلجى، التعريف بمساجد السليمانيية و مدارسها الدينيية، بغداد، ١٩٣٨.

- محمد غنيمى هلال، النقد الادبى الحديث، بيروت، ١٩٧٣.
- الشيخ محمد بن مصطفى بن احمد الشهير بالشيخ معروف النودهى، العمال الكاملة (المتفرقات) تحقيق مجموعة من أوقاف السليمانيية، مطبعة العانى، بغداد، ١٩٨٨.


**فارسييەكان :**


- على أكبر شهابى، خراسانى، روابط ادبى ايران و هند يا تأثير روابط ايران و هند در ادبيات دورة صفوية، طهران، اسفندماه ١٣١٦.
- محمد تقى بهار، سبك شناسى، يا تأريخ تطور نثر فارسى، جلد أول، چاپ دووم، ١٣٣٧.
- صائب و سبك هندى، مجموعة سخنرانيهاى ايراد شده در مجمع بحث در افكار و اشعار صائب به كوشش محمد درياگشت، تهران ،١٣٥٤.


**ئينگليزييەكان:**


- J.A Cuddon, A Dictionary of Literary Terms, (London: Andre Deutsch, 1977).
- Coles Editorial Board, Dictionary of Literary Terms, (Toronro; Coles Publishing Company Limited, 1980)

# Abstract

*The thesis deals with "stylistic" which is regarded the basic aspect of literature. Generelly speaking it includes the style of Kurdish classic poetry during a period of Kurdish literary history "An Era of affluence" within Sulaimany territory.*

*In the first chapter the researcher deals with the style and stylistics including theories and definitions about them in details, trying to show differences between many forms which differ according to different sybjects, poetry in particular, reinforced by the sources concerning this study.*

*While in the second chapter he deals with the form "the visible face of the style" and the nature of using poetic language by the poets of the same school within Sulaimany territory and the most outstanding styles used not only by the poets of that period, but the generation coming after them also. He makes a survey of the unitive Kurdish language, the usage of the words and terms common at that time, the effect of the language and literature of the neighboring nation on the poetic language of those poets, and that effect is regarded an aspect of Kurdish literature at that period, And he deals with the subject of "metre and rhyme" and whether the Arabic methods are apt to be used by those poets "Ramel" and "Hazeg" metres in particular, which the poets of that ers and after used.*

*In the third chapter he takes up the artistical nature of the same poetry school which includes "Naly, Salim and Kurdy" and the most important artistic characteristics of each of them and how much they differ by having their own ways with the most outstanding elements that make up their own poetic styles followed by three of them, but briefly, as we see "Kurdy" is known for his clearity, but Salim is ambiguous and more complex than the two of them.*

*The study comes in contact with some linguistic and grammatic items as concerning the poems with a formalist study of some lines intending to show the most important stylistic characteristics. In addition, the study covers Salim's style for playing on language by using interchanging .*

*To sum up it the study uncovers the most important artistic characteristics of a poetry school whose Kings are "Naly, Salim and Kurdy" going thuough the formalist nature which is a clear mark of the same school.*

## له بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی کوردۆلۆجی

### بەرهەمی نوسین

١-فەرهەنگی ڕێزمانی کوردی، د. کەمال میراودەلی.

٢- فەرهەنگی زەویزانی، جەمال عەبدول.

٣-حركات الخوارج فی غربی إقلیم الجبال وشهرزور والجزیرە الفراتیە:عطا عبدالرحمن محی الدین.

٤- سۆفیزم و کاریگەریی لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورددا: ١٨٨٠- ١٩٢٥، د. جەعفەر عەلی رەسوڵ

٥-قـضـــاء هەڵـەبجـە، دراسە فی الجغرافیە الإقلیمیە: عطا محمد علاءالدین.

٦-رۆڵی هۆکـــارە سیاســـییەکان لە دابەشبوونی دانیشتوانی پارێزگای سلێمانیدا: جاسم محەمەد محەمەد عەلی.

٧-پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا، ١٩٩١-١٩٩٨: هێرش عەبدوڵلا حەمەکەریم.

٨-رۆژنامەگەریی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپاو ئەمریکا، ١٩٤٩-١٩٩١ ، نەوزاد عەلی ئەحمەد.

٩-هوشیاری کۆمەڵایەتی، فواد تاهیر سادق

١٠-شاری سلێمانی ١٩٣٢-١٩٤٥ ، د. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی.

١١-إقلیم كوردستان العراق في دائرة السياسات النفطية العالمية، د. محمد رؤوف سعيد مهندس النفط زمناكو سعيد

١٢-بەعەرەبکردن لە هەرێمە کوردنشینەکاندا ٦٣- ٨٤٧ ز، **رحیم ئەحمەد ئەمین**

١٣-تعريب قضاء خانقين من منظور جيوسياسي، صلاح الدين انور قيتولي

١٤-کۆیە، کامەران طاهر سەعید

١٥-بوون لە شیعری مەحویدا، د.محەمەد ئەمین عەبدوڵلا

١٦-شێواز لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا، حەمە نوری عمر کاکی

١٧- ئەرمەنۆساید، مامەند رۆژە

١٨-کولتوور و ناسۆنالیزم، د. رەفیق سابیر

١٩- بنیاتی کارنامەیی لە دەقی نوێی کوردیدا، د. عبدالقادر حمە امین محمد

20/Report on the Sulaimani District of Kurdistan, E.B. Soane.

### بەرهەمی وەرگێڕان

١-کۆمەڵکوژییەکەی دەرسیم، حوسێن یڵدرم، لە سوێدییەوە: کاوە ئەمین.

٢-جەنگی عێراق، کاپلان و کریستڵ، لە ئینگلیزییەوە: عەبدولکەریم عوزێری.

٣-یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد لە سەردەمی نوێدا، م. ئە. حەسرەتیان، لە روسییەوە: د. دلێر ئەحمەد حەمەد.

٤-سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ئی.بی. سۆن، لە ئینگلیزیەوە: مینە.

- **گۆڤاری کوردۆلۆجی، ژمارە یەکی ساڵی ٢٠٠٨**

